کۆمـــاری عیـــراق
وەزارەتی رۆشنبیری و راگەیاندن
دەزگای رۆشنبیرەو بلاوکردنەوەی کوردی
زنجیرەی ژمارە (١٤٥)

# هۆزەکانی کورد

وەرگێران و ئامادەکردنی
حسین احمد جاف

نووســـینی
ئی • جەی • ئار
هینری فیلد

The Kurdish Tribes

By

E. J. R.

The Anthropology of Iran and Iraq

By

Henry Field

ئەم کتێبە پێشکەشە بە گیانی پاکی دایکم سەزادە•••زێڕین حەمە فەرەج خەیات ئەو ئافرەتەی کە خۆشی ژیانی کوردەواری وخۆشەویستی کوردایەتی لە دڵ و دەروونمدا ڕوواند •

•••• حسین



# پێشەکی

ئـەم پەرتوکـەی بەردەستان •• بەرهەمی دوو کۆمـەڵە تێبینی بەنرخی دوو پسپۆری بێگانەن کـە یەکەمیان زانـا و ئەنترۆپۆلۆژستی جیهانی بەناو بانگ ( هێنری فیلد ) ە و دووەمـیشیان ( ئی جی ئار )ە کە لێپرسراوێکی ئنگلیزی گرنگ بووە لە عیراق پاشی داگیرکردنی لە لایەن ئنگلیزەکان و ئـاوابوونی رۆژی ئیمپریالیزمی عوسـمانیەکانلەم نیشتمانە و تێگرای ناوچـەکەی گرتـەدەست لـە سـەرەتای ئـەم سـەدەیە • گرنگی ئـەم پەرتوکە لـەوە دایـە کە باسی کۆمەڵە خێڵێکی کوردە دەکات کە ناویان لە هیچ سەرچاوەیەکی تردا نەهاتووە •• ئـەم راستیەش پەومان بۆ سـاغ دەکاتەوە کە(فیلد)ی زانا لە بەر چـەن هۆیەکی زانسـتیانە و (ئیجیئار)ی لێپراسراو لەبەر چەن هۆیەکی تایبەت بە ئینگلیزە داگیرکەرەکان خۆیان و بە بەرژەوەندیە کانیانەوە لە ناوچەکە ••• ئەم دوو پسپۆرە توانیویانە هەر یەکێ بە گوێرەی توانایی خۆی

وئەو هەللانەی بۆی ڕەخساو بوون گەلێ شتی بەنرخ کۆبکەنەوە لە بارەی خێڵەکانی کوردەواری و شۆێنەوارەکا نیانــــەوە ... سەرباری ئەمەش باری ئابووری و توانایی ســەربازی و گرنگی ناوچەکەیانلە ڕووی ئیستراتیژیەتەوە دەخەن بەرتیشک جگە لە ناوهێنان و ناساندنی پیاوە گەورەکانیان ئەوشــانەی باسمان کردن زیاتر پەیوەندیان بەتێبینیەکانی (ئی‌جی‌ئار)ەوە هەیە کە لەم پەرتووکەدا جێگەیان بۆتەوە ســەرباری تێبینیەکانی هینری فیلد کە ئەویش بەش بە حاڵی خــوێ کۆمــەڵێ تێبینی زانستیانەی دیکەی لەم پەرتوکەدا خستۆتە بەر دەستی خۆینەری بەڕێزمان کە نەك هەر تەنها نوتن سەربارەت بە خۆینەری کورد و کتێبخانەی کوردیەوە بەلکو زیاتریش گەلێ لەو گیر و گرفتە ئەنثرۆپۆلۆژیانەمان بۆ ڕووندەکەنەوە لە بارەی کۆمەڵگاکانــی کوردەواری و نەژادی کوردەوە لەبەر ڕۆشنایی زانســت و مێژووەوە .

لەوانەیە بەلای هێندی کەس لەم سەردەمەدا ســەیر بــێ پەرتوکێکی ئاواهی بەجاب بکات کە باســی هۆز و هۆزایەتی بکات لەدوا چارەکی سەدەی بیستەمدا ... جونکە ئەم مەسەلانە ــ ئەمرۆ ــ بەشتێکی سەر بە ڕابووردو دەدرێتە قەلەم ئەگــەر بەشتێکی دواکەوتوو دانەنرێ بەلام وەرامی مــن بۆئەو جۆرە کەسانە ئەویە کە ئێمەی کورد هەر دەبێ وەك میللەتانی تر لق و پۆکانی خۆمان بگێڕینەوە سەر بنجی ڕەسەنی خۆیان ..ئەمــە تەنها مەبەستی منە لە وەرگێڕان و ئامادەکردنی ئەم پەرتووکــە

شایەنی باسە تێبینییەکانی کتێبەکەی فیلد زیاتر لـەو هۆزانـە ئەگرێتەوە کە بەشێوەی گرمانجی خـواروو و لـوڕی ئاخافتن دەکەن و ئەوانەی )ئی‌جی‌ئار( باسی ئەو هۆزانە ئەکەن کە بـە شێوەی گرمانجی سەروو قسەدەکەن •

زۆربەی ئەم تێبینیانە ئەگەڕێنەوە بۆ دوا سالانی سەدەی نۆزدەهەم وئەوجا بیستەم جائەگەر پەراوێزێکی زۆر لەم کتێبەدا نەبێ ،ئەوە لەبەر ئەوەیە کە ئەم‌تێبینیانە ـ خۆیان لە خۆیانـدا ـ بەتایبەتی ئەوانەی (فیلد) پەراوێزی کتێبە بەنرخەکەی (فیلدن) کە لە ژێر ناو و نیشانی ( ئنرۆپولوژیای ئێران) مو لە سیەکاندا بەچاپ گەیشتووە •

بەغدا

کانونی‌دووەمی ١٩٨٥

# ( میدیەکان ــ مادەکان ــ )

● میدیەگان لەو هەرێمەدا کە ئەکەوێتە سەرووی ناوچەی فارسەکانەوە دائەنیشن[1]

× « هیرۆدۆتس IV - 37 »

● خێلە میدیەکان دوو بەشن : نیشتەجێ و کۆچەرین[2]

× « پەراوێزی نووسینەکەی هیرۆدۆتس - Lawrence »

● لە ناو هەموو گەلە ئێرانیەکاندا لە «ئنجیل»ی پیرۆزدا تەنیا ناوی میدیەکان هاتووە [3] .

دیخانیکوف
« De Khanikoff Page - 343.

● ئاشووریەکان سالی «٨٤٠»ی پێش زاین شالاویان برۆتە سەر نیشتمانی میدیەکان کە ئەکەوێتە کەژەکانی کوردستانی رۆژهەلاتی دەریاچەی « ورمێ »وە[4] .

« سایس Sayce, P.P. 73.74. »

● لە پاشماوە هەلکۆلراوەکانی سەردەمی ئەخمینیەکاندا وێنەی هیچ ئافرەتێکی میدیایی بەدی ناکەین ــ لەوانەشە کوردە «فطری» یەکان..واتە لورەکان نزیکترین هۆزی کوردبن لە مادە کۆنەکانەوە[5] .

Rawlinson, Vol.2 page 307

● میدیەکان و پروتومیدیەکان بە نەژاد ئاریایین [6] .

« Finn, P.P. 33 »

● کوردەکان لە نەتەوەی میدیەکانن [۷] .

» سیر ولسن Sir Wilson

● یەکێ لە ونووسراوە ئاشوریانەی سەدەی نۆیەمی پێش

زاین باسی مادای „Madai« و مادا „Mada« ومیدز „Medes«

ئەکات کە لە نێوان دەریاچەی ورمێ و دەشتایەکانی هەمەداندا

گیرسابوونەوە [۸] .

Henry Field, 1935, P.P. 6b.

هینری فیلد ــ سالی ١٩٣٥ لاپەرە «٦ ب» .

لە سەرچاوە یۆنانی و لاتینیەکاندا ناوی کورد بەم

شێوەیەی لای خوارەوە هاتووە :

گورد - Gord - «کورد» - Kord - « » [۹] .

« Lawrence, Loc. cit.

● ناوەکو ئەمڕۆش کوردستان هەر نیشتمانی رەگەزێکی

جەربەزەی رەسەن و ملهوڕە .ناوچەکانی ئەمبەر و ئەوبەری

رووباری دجلە لە ژێردەسەلاتی تورکەکانە و بەشەکەی تریشی

لە ژێر رکێفی فارسەکاندایە .دوو سەد خێلی کورد لەگەل

هۆزەکانیاندا لە سەرووی مەشهەد و چیاکانی خۆراسان نیشتەجێ

بوون [۱۰] .

× » مالکولم ــ « Malcolm. Page. 23

● زمانی کوردی Kourdi برێتیە لە تۆ خێزانی زمانی

و ژمارەشیان «٧٩» هەزارە[11] .

« Shobery - Page 20 - ×» شوبیری ــ

● وشەی کوردستان لە سەردەمی کۆندا بە شێوێنی کاردۆکی‌یەکان ئەوترا [12] .

« F. Milliagen.. « مێجەر فەرەدریك میللنیچن

● کورد میللەتێکی ئاری نەژادە و درواسێی فارسەکانە و فارسیش نیە [13] .

« Prichard, P. 171 - × « پریچارد ــ

● بەشێوەیەکی گشتی چاوی کوردان رەشە و گەورە ترە لە چاوی ئەفغانستانی‌یەکان و .. کەمێ چوار گۆشەیە بۆیە لە چاوی دانیشتوانی رۆژئاوای فارس و تاجیك و پشتوویەکان جیاوازە ..

بەلام پشتوویەکان لە کوردەکان نزیکترن وەك لــە قەومەکانی تر [14] .

[ Khanikoff, Page 55 ].

کوردە لوڕەکان لە رووی بالا و هەیکەلی سروشتی‌یەوە لە بالا وهەیکەلە سروشتی‌یەکەی میدیەکان ئەچی .

[ Rawlinson Part - 2 P. 30 ] راولینسون

● بە پێی راپۆرتەکەی هوتوم شیندەلەر « Schindler Houtum » ژمارەی کورد و لەکی ئێران «١٣٥» هــەزار خێزانە و «زولوتاریف» « Zolotaref » ژمارەیان بە «٦٠٠» هەزار خێزان دائەنێ[15] .

× « بەرگی ٢ Curzon, 1892, Vol. 27. P. 492, 494 » کیرزن )

٫● وشەی کوردستان و شەیەکی جوگرافیایی تـــەواوو شیاوی گشتی ناوچـــەکەیە کە پانایی و درێژایی ئەگاتـــە «١٥٠» هەزار میلی چوار گۆشـــەیە و کوردەکانی تێـــدا نیشتەچێن ٠زوربەی زۆری خاکی ئەم ناوچەیە لە ژێر دەسەلاتی فارس و تورکدایە ٠٠ جا بۆئەوەی زیاتر لە نەرەتی رەســەن و نەژادی باوک و باپیرانی کوردەکان بگەین ٠٠پێویـستمان بـە لێکولینەوەیەکی تێر و تەسەلی زانستیانە هەیە ٠٠ چونکە ئـەم کارە هێشتا پۆشتەو پەرداخ نەکراوە ٠٠-بەلام ئـەوەی کـە زانـراوە ئەم گەلە بە نەژاد ئەچنەوە ســـەرکاردۆخیەکانی گزینفون ٠٠چونکە لە رووی سەر و سیما و رووالـــەت و هەروا بەناوە کانشیاندا ئەچنەوە سەر کاردۆخیەکان و ئـەم وتەیەش پیویستی بە لێکولینەوەی فراون و قولتر هەیە

Curzon. Vol. I. P. 549-551

● کوردەکان خۆیان لەکن و بەشـێکیان لە نـاوچـەی کوردستاندا پەرتوبلاون

پەرتوبلاون(٧)

× « کیرزن Curzon. Vol. I.I. P. 549 - 551 »

● ژمارەی ئەو کوردانەی ئێـستاکە لەژێر دەســـەلاتی تورکەکاندان ملیۆن یان ملیۆن و نیوێك ئەبن و ٠ ئەمە بێ جگە لەو کوردانەی کەلە خورساندا کیرساونەتەوە ٠

Lawrence L6C. cit. 7.

کوردەکان بەشێوەیەکی سەرەکی .. لە دانیشتوانی تورکیای بەشی ئاسیان بەڵام تورکێنین و سەر بە خێزانی زمانە ئێرانی‌یەکانن ..کوردەکان و ئەرمەنەکان نیازی ئەوەیان هەیە دەست بەسەر هەموو ناوچەی ئاسیای بچوکدا بگرن .ژمارەی کوردەکان خۆی ئەدات لە دوو ملێون کەس و زوربەشیان لە تورکیا لە بەشی ئاسیایی‌دا ئەژین و ئەوانی تریان لە ئێران و ژمارەیەکیشیان لەگەڵ قۆقازەکاندا پێکەوە ئەژین .. شاڵاوەکانی مەغۆل و تورکەکان بەهیچ جۆرێ کاریان تێ نەکردن .. رەشتاڵە و چاورەش و باڵا ناوەندین و لوتیان‌درێژ یاخود «محکوف» قۆقزە زۆربەی خێڵەکانیشیا ئەگەرمیان و گوێستان ئەگەن[18] .

× « ریپلی — Ripley. p.p. 442. 452-

● کوردراهە « Kudraha »

کاردۆچی « Carduchi » ..ئەم وشەیە رەنگە لەکوردراهەی نووسراوەی ئۆمەری‌یەکانەوە هاتبێ هەر ئەمانەش بوون کە گزەینەفۆن ناوی هێناون[19] .

« Curzon, 1892, Vol. P.P. 549 - 551 »

● مازیندەران کاتی خۆوی لەلایەن کوردەوە ئاوەدان کراوتەوە .. کوردی ناوچەی کوردستان و مزیندەران بەخرێنە خانەی گەلە ئێرانی‌یەکانەوە و ئەمەش لەبەر لەیەکچوونی زمان و سەر و سیما و رواڵەت و

روخسارەوە .. بەڵام کوردی ناوچەکانی ناوەڕاستی ئێران لە هۆزەکانی تری کورد جیاوازن ..ئەمەش لە رووی کەڵەگەتی باڵا و دەم و لوتە باریک وجوان و دەم و لێو و چاوەکانیانەوەیە بەڵام بە گشتی گەلێکی توکنن و لێوەکانیان تەنک و ئەستورن و ددانەکانشیان وردن و قۆناغی گوێزانەوەن لە نێوان هــۆزە

« 168. 2 »

نیشتەجێ کۆچەریەکاندا

## ـ هۆزەکانی ـ لەك و لوڕ

لەك ـ « Lek »

بەپێی راپۆرتەکەی « Houtum - Schindler »

ژمارەی لەکی کورد خۆی له «١٣٥» هەزار خێزان ئەدا[٣٠] .

« Gurzon, 1892. Vol. 2. P. 492 - 494 »

لەك وەك چینێکی کۆمەڵایەتی ناوێکی دیاری نیە بەڵام بە شێوەیەکی باو و بڵاو لە ناو کورد و لوڕ و فەیلی و بەختیاری و مامەسانی وەك چینێك و وەك بەشێك لە لوڕەکان ناسراون .. ئەم هۆز و خێڵانەی سەرەوە تارادەیەك یەك رەگەز و یەك بنەچە پێکدەهێنن ..ئەوەی زانراوە ئەوەیە کە ژمارەیەك لەم «لەکانە لە ناوچەی ئەردەڵان لە نزیك لەیلاوخەوە جێ گیر-بوون و ژمارەشیان لەم ناوچەیەدا هەزار خێزانێك ئەبێ و لوڕەکان بە کوردەکان ئەڵێن «لەك» [٣١] .

—

Field, Antropology of Iran page, 627.

فیلد ـ ئەنترۆپۆلۆژیای ئێران

● لوڕەکان بەشێکی سەرەکین لە هۆزەکانی «لەك» و لەکیش کەمایەتییەکن و نیشتەجێن رەنگە بابەتی «لور»

پێویستی بە لێکۆلینەوەیەکی زۆرتر هەبێ بەلام ئەوەی کـــە ئێستە لامان روونەکە ئەمانە سەر بەو کۆمەلە ئەتنۆلۆژیەن کە کورد پەیوەندی‌یەکی قول و سەرەکی پێیانەوە هەیە .. لەوانەـ ـشـە دیالێکتی لوری کەمێ لەفارسی‌یەوە نزیک بێ بـەلام شێوەی بەکارهێنانەکەی لەگەل زمانی کوردیدا جیاوازی‌یەکی ئەوتۆی نیـە .

زوربەی زۆری نوسـەرەکان لورەکان بە پاشماوەی ئارـ ـیایی کۆنەکان دائەنێن چونکە هەر لە کەژ و کێوەکانـــی ئێـــستەیدا پەیدابوون و شارستانی‌یەتی خۆیانیان دامەزراـ ـندووە و هەر لە کۆنیشەوە لەم شوێنەدا سەقام گیربوون .

وشەی «فەیلی» واتای (یاخی‌بوو) ئەبەخشێ.. فارسـەکانی ئەم سەردەمە بەو کەسانە ئەلێن «لور»کە گێژ و سادە و ســاکارن .. بەپێی ســەرژمێرکردنی «راولینــون ـ سالی ١٨٣٦ی» ژمارەی فەیلی‌یە لورەکان و تیرەکانیان نزیکەی «٥٦» هەزار خێزانە ..کەچی لەولاوە « لاپارد» سالی ١٨٤٣ ئەلێ ژمارەیان «٤٩» هەزار خێزانە .. لەلایەکی ترەوە (راولینسون) ژمارەی بەختیاری‌یەکان‌بە«٢٨,٠٠٠»خێزان داناوە..کەچی راپۆرتێکی‌تر کە سالی ١٨٨١ دەرچووە ژمارەی ئەم هۆزانەمان بەم جۆرەی لای خوارەوە ئەداتێ :

فەیلی و تیرەکانی : «٢١٠» هەزار

بەختیاری و تیرەکانی : «١٧٠» هەزار

گوگیلو ٥٥هند : «٤١» هـەزار

ئەوەشی کە مەبەستە لێرەدا بیڵێین ئەوەیە کە ئەم سەرژـمێرییە ژمارەی گشتی لورەکانی بـە «٤٢١» هەزار کەس دانـــاوە •

زاراوەی فەیلی پتر پەیوەندی بە دانیشتوانی پشتکۆوە هەیە زیاتر لەوەی پەیوەندی بە هەرێمی لوری بچووکەوە هەبێ •

لورەکان لە رووی ڕاین و قەدو باڵای سروشتییەوە بـــە تێکرایی زۆر لە تیرە کۆنەکانی ئێران ئەچن [٣٢] •

بەرزایی باڵا : ١٦٨ سانتیمترە •

× « دانیلۆڤ « Danitov »

مامەسانی

ئەمانە بەشێکی سەرەکین لە تیرەی «لەک» و لقێکن لـــە «لورەکان»[٣٣] •

× « کێرزن « Curzon, 1892 - »

● دیالێکتی لوری « Luri »

بریتییە لە شەست خێزانی بچوکتر و لە «٨٤/٥٠٠» کەس زیاتر گفت و گۆی پێ ئەکەن و فەیلی و بـەختیاریش هـــەر لەوانن[٣٤] •

× « شوبیری « Shoberi. P. 20 - »

● کوردە فطرییەکان واتە ــ لورەکان ــ لە رووی هەیکەل و قەد و باڵا و شان وشەوکەتەوە لەگـەڵ مادە کۆنەکانـــدا

یەکن[٢٥] .

Rawlinson, Vol. 2. P. 307.

● زولوتاریف ـ Zolotaref ـ ساڵی ١٨٨٨ ژمارەی لوڕەکانی بە «٧٨٠٠٠» کەس داناوە بەڵام هـۆتوم شیندلر ـ Houtum. Schindler ـ ـ ژمارەی خێزانی لـوڕ و بەختیاریەکانی تێکرا ساڵی ١٨٨٤ بە «٤٦/٨٠٠» خێـزان دانـاوە[٢٦] .

« Curzon, 1892. P. 491 - 492 »

● کۆهکیلو « Kuhcalus »

سەرژمێری ساڵی ـ ١٨٨١ ـ دەری خستووە کە لە ئێران ژمارەی ئەم هۆزە «٤١» هەزار خێزانە .. هتد .ئەمانەیە ڕەگەز لوڕن ..قەشقایەکان کەمێ لەمان جیاوازن[٢٧] .

« Curzon, 1892. Vol. 2 P.P. 273 - 275 »

Curzon, 1892. Vol. 2. P. 112 - 114.

● گۆران – Goran –

خێڵێکی کوردە لە دەور و بەری کرماشاندا نیشتەجێیە و بەشێکی کۆچەرە وئەوی تریشی لە نێـوان مای دەشـــت و هاروئشینخاندا دانیشتوون و باوەڕیـــان عەلی ئەللاهیە و ژمارەیان پێنج هەزار خێزانە .

● سنجابی – Sinjabi –

هۆزێکی کوردە لە ناوچەی مای دەشـت کە لەکەوتـە

خۆراڤاوی ناوچەی کرماشاندا نیشتەجێیە و ژمـــارەیان (١٥) هەزار خێزانە[٢٨] • هەمویان عەلی ئەللاهین

« کرزن » Curzon, 1892. Vol. 1. P. 55. »

● تەتەر •

هیچ تەتەرێك لە کوردستاندا جێ ی نەبۆتـەوە •

« مالکولم _ Malcolm, Vol. 2, P.P. 207 - 210 »

● سەنگورو - Sunguru -

هۆزێکی کوردە لەسەرووی اوچەی کرماشاندا نیشتەجێیە و ژمارەیـــان لەگەڵ هـــۆزی کولیایدا نزیکـەی (٢٠٠٠) خێزانن[٢٩] •

« کرزن » Curzon, 1892, Vol. L, P. 557 - »

● زنجینە ـ زانجینە - Zenijnah - Zangenah -

هۆزێکی کوردی شیعەیە و لەناوچەی کرماشاندا سەقامگیربووەو ژمارەی «١٥٠٠» خێزانە[٣٠] •

« Curzon, 1892, Vol. 2, P.P. 112 - 114 »

● مەعافی ـ مەئافی ـ - Ma'afi -

هۆزێکی کوردە ••لە ناوچەی کرماشاندا نیشـــــــتەـ ـجێبووە[٣١] •

[ Curzon, 1892, Vol. 1, P. 557 ]

● نانەکەلی - Nanakuli -

هۆزێکی کوردە ژمارەی ســـێ سەد خێـزانێکە ••لە ڕۆژئاوای کرماشاندا جێگیرە[٢٨] •

[ Curzon, 1892, Vol. P.P. 555 - 557 ]

● ئاخوڕ — Akhur —

هۆزێکی کوردی کرماشانییە و ژمارەی هەزار خێزانە[٣٢]

[ Curzon ]

● جەلیل وەند [ Jelilwand ]

هـــۆزێکی کـــوردە .. لە ڕۆژهەڵاتی کرماشـــاندا جێ گیر بووە[٣٣] .

[ Curzon, 1892, Vol. 1, P. 55 ]

● جەلال وەند [ Jelalwand ]

هۆزێکی کوردە لە ناوچەی کرماشـاندا جێ گیرە و لـە ژێر دەسەلاتی سەرتیپی «کرند» دایە .. لەگەڵ هۆزی بابا ـجانیدا ژمارەیان خۆی لە هەزار خێزانێك ئەدات[٣٤] .

[ Curzon, 1892, Vol. 1, P. 557 ]

● هەمەوەنـــد - Hamawand -

هۆزێکی کوردی کۆچەرییە ..بەلام لە ناوچەی کرماشاندا گیرسانەوە و ژمارەیان (٢٠٠) خێزانێك ئەبێ[٣٥] .

[ Curzon, 1892, Vol. 1, P. 557 ]

● خزل — Ghazll —

خێلێکی کـــوردە لە دەروبەری کرماشـــاندا نیشتەـ جێیـــە[٣٦] .

[ Curzon, 1892, Vol. 1, P. 557 ]

کەلهـور :

خێلێکی کوردە لە دەروبـەری سەقزیشـــدا هێندیکیان نیشتەجێن کە ژمارەیان لەوێدا (٣٠٠) خێزانێك ئەبی(٣٧) .

[ Curzon. 555 - 557 ]

ئەم کەلهوڕانە لە ناوچەی کرماشاندا لە (٥٠٠٠) خێزان زیاترن و بەشێکیان کۆچەرن و ئەوانی تریان نیشتەجێن ..هەوارگەی هاوینیان چیاکانی سەرووی رۆژئاوای ناوچەی پشتکۆیـە و زستانان ئەگەڕێنەوە بۆ تەختای‌یەکانی دەشتی زەهاو و قەسری شیرین و ناوچە سنووری‌یەکانی نێوان عیراق و ئیران .. ئەم خێلە عەلی ئەللاهی وشیعەی ئێجگار زۆرە .

« Hululan »      هولولان

● هۆزێکـی لورە بـەلام ناوی لە لیستەی هـۆزەکانی کرماشـاندا هاتووە ..ئەم هۆزە کۆچـەرە و لە شاخـەکانی رۆژهەلاتی باشوری کرماشان و بەرزاییەکانی روباری کەرخەدا پەرت و بلاو بوونەتەوە . ژمارەیان خۆی لە چوار هەزار خێزان ئـەدا(٣٨) .

[ Curzon, 1892, Vol. 1, P. 557 ]

## ـ خێلەکانی ناوچە ئەردەلان

● تیلەکۆ      – Tailaku –

ئەمانە کوردی ناوچەی ئەردەلانن و لە نزیك هەواجـۆ – Hawaju – وە جێ‌گـیربـوون و ژمـارەیـــان «٦٠٠» خێزانە(٣٩) .

[ Curzon, 1892, Vol. 1, 555 - 557 ]

● مەلمی — Munml —

ئەم هۆزە کوردەو لە نزیک «حسن ئاباد»ی سەر بەناوچەی ئەردەلان نیشتەجێیە و ژمارەیان (٥٠٠) خێزانە[٤٠] .

[ Curzon, 1892, Vol. 1. 555 - 557 ]

● جابراچی — Jabrachi —

هۆزێکی کوردی ئەردەلانی‌یە ..لە ناوچەی « بیلەوەر»دا نیشتەجێیە و لەگەڵ هۆزی «مامون»دا ژمارەیان ئەگاتە نزیکەی «٣٠٠» خێزان[٤١] .

● گولباخی .. گەلباخی « Gulbaki »

هۆزێکی کوردی ئەردەلانی‌یە ..لە دەوروبەری هەواجۆدا نیشتەجێیە ..ژمارەی ئەم هۆزە (٥٠٠) خێزانە[٤٢] .

[ Curzon, Vol. 1, 555 - 557 ]

گەشکی ، گۆشکی — Gushki —

هۆزێکی کوردە لە نزیک بێلەوەردا نیشتەجێیە «٤٠٠» خێزانێک ئەبێ[٤٣] .

[ Curzon, Vol. 1, 555 - 557 ]

● مامون — Mamun —

هۆزێکی کوردی نیشتەجێیە و لە نزیک بێلەوەر»ی سەر بەناوچەی «ئەردەلان» گیرساوەتەوە .. لەگەڵ هۆزی

جابـــراجـی‌دا« Jabracht ژماره‌یان نزیکـــه‌ی « ٣٠٠ » خێزانه (٤٤) .

[ Curzor, 1892 ]

● گورگه‌یی ..گورگای - Gurgai -

خێلێکی کـورده ..له ناوچـــه‌ی یله‌وه‌ر نیشـــته‌جێ ـ بوون (٤٥) .

## ـ خێڵە کوردەکانی ناوچە ئازەربایجان ـ

● مەنگوری .. کوردی ناوچەی ئازەربایجانن و لە باشووری سابلاغ جێ‌گیرن و سوننین و نیشتەجێن و «٥٠٠» خێزان ئەبن [٤٦] .

[ Curzon, 1892, Vol. 1. P.P. 553 - 555 ]

● ئورمار – Ormar –

کوردی ئازەربایجانن .. ئەم هوزە لە هاویندا لە سنوور ئەپەڕینەوە ئەودیو .. واتە بۆ «تورکیا»[٤٧] .

[ Curzon, 1982, Vol. 1. P.P. 555 - 557 ]

● قەرەباغ – Qarababagh –

کوردی ئازەربایجانن ..ئەم هۆزە لە گوندەکانی دەشتی سولدز – Sulduz – و برادۆز ـ – Beraduz – نیشتەجێن وشەمەن ، ژمارەیان لە سێ هەزار خێزان زیاترە [٤٨] .

[ Curzon, 1892, Vol 1, 2, P. 27 ]

● شەمشیری – Shamshiri –

هۆزێکی کوردی سەر سنوورە .. لە هاویندا ئەچنە ئەودیو ..واتە بۆ «تورکیا» چوار سەد خێزان ئەبن [٤٩] .

[ Curzon, 1982, Vol. 1. P.P. 555 - 557 ]

● شـــکاك     – Shekak –

هۆزێکی کوردی ئازەربایجانە و سونین و ژمارەیان «١٥٠٠» خێزانە [٥٠] .

[ Curzon, 1892, 555 - 556 ]

● موکری     – Mukri - Mikiy –

کوردی ئازەربایجانن ..لە رۆژئاوا و باکوری رۆژئاوای سابلاغدا ئەنیشن ..سونین و نیشتەجێن .. ژمارەیان خۆی لـە دووهەزار خێزان ئەدا [٥١] .

[ Curzon, 1892, Vol. 1. P.P 555 - 557 ]

ژمارەی کوردەکانی ناوچـەکانی تـورکیا و ئازەربایجان هەمیشە لە کەمی و زوریدا بوون [٥٢] .

[ Wilson, 1932, P.P. 6 9- 70 ]

خێڵە کوردەکانی ناوچـەی لورسـتان و خوراســـان زۆرن [٥٣] .

ویلسون     [ Wilson, 1932, P.P. 33 34 ]

● شێخ سـمایل     – Sheikh Ismail –

هۆزێکی کـوردی کۆچـەریـە لە ناوچەی ئەردەڵان و دەوروبەری ئەسفان ئابادان Isfan Abad بە زستانان لە دەوار وخێوەتدا ئەژین و هاوینان ئەچنە هەرێمەکانی تورکیا ..ژمارەی ئەم هۆزە «٣٠٠» خێزانە [٥٤] .

● ماموش .. مامش     – Mamush –

هۆزێکی کوردی ئازەربایجانیە لە ناوچەی لاهیجـان و رۆژئاوای باشوری سابلاغدا نیشتەجێیە سونین ژمارەیان «٣٠٠» خێزان ئەبێ [٥٥] .

[ Curzon, 1892 ]

● هەرکی - Herki -

کوردی ناوچەی ئازەربایجانن .. وەرزی هاوین لە ئێراندا بەسەر ئەبەن و لە زستاندا بۆ دەشتای‌یەکانی موسـڵ ئەچنەوە ژمارەیان ئەگاتە دوو هەزار خێزان [٥٦] .

کیرزن [ Curzon, 1982, Vol. 1. P.P. 555 - 557 ]

● پازیکی - Pazeki -

هۆزێکی کوردی کۆچەرە . ژمارەی هەزار خێزانەو لـە دەور و پشتی ڤێرمن - Vermi n - و خار - Khar - نیشتەجێن .. لە مێژدا ئەم هۆزە زۆر بە توانا و ئازابوون ــ لـە دەور و بەری ئەرز رۆمدابوون..بەڵام لە سەرەتای سەدەی «١٦»هاتووە بەرە و خوار پەیتا پەیتا پەرت بووە تا تەفر و تونا بـوو .. بەشێکی جووە ئێران و لەوی مایەوە .. بەشێکیان مـاون بـە کوردی ئەدوێن بەڵام بەشێکی تریان بە تورکی گفت و گـۆ ئەکەن و

هوتوم شیندەلەر [ Houtum, Schindler, P.P. 48, et, Seg. ]

هەندێکی کەشیان لە ناوچەی « پازیکیانە» لە رۆژهەڵاتی تاراندا دائەنیشن [٥٧] .
48 - 49

## ـ خێڵە کوردەکانی ناوچەی خۆراسان ـ

● عمرلو — Amarlu —

ئەم خێڵە لە لایەن شا عەباسەوە لە بەرزایەکانی باکوری ڕۆژئاواوە بۆ خۆراسان دوور خراوەتەوە(٥٨) .

کیرزن [ Curzon, 1892 ]

● شاه دیللو — Shahdillu —

هۆزێکی کوردە .لە خۆراسان جێگیر بووە .. ئەم خێڵە کاتی خۆی شاعەباس لە «بیجورد»ەوە لە هەریمەکانی ڕۆژئاوای باشورەوە بەرەو چیاکانی خۆراسانی کۆچی پێ کردوون (٥٩) .

[ Curzon, 1892, Vol. ID 228 ]

● کوردەکانی زعەفەرانلو

— Zaafaranlu Kurds —

ئەم خێڵە کوردە لە ناوچەی «کۆچانی» سەر بە خۆراسان جێگیربوون ..کاتی خۆی شا عەباس لە ناوچەکانی سەروی ڕۆژئاواوە بۆ بەرزایەکانی خۆراسان ڕەوانەی کردوون (٦٠) .

کیرزن | Curzon, 1892, Vol. 1, P. 191 |

ـ کوردەکانی خۆراسان زیاتر لە وەی لە کوردەکانی ناوچەی ڕۆژئاوای کوردستان بچن لە لورەکان نزیکترن (٦١) .

هینری فیلد [ HenryFleld ]

کۆردێکی زۆر لە ناوچەی خۆراساندا نیشتە چێن (٦٣) .

سایکس [ Sykes, 1921, Page 392 ]

ــ شا عەباس ئەو کوردانەی کە لە مەڵبەندی خۆبانــی هەڵکەندوون ..پاش هەڵکەندنی خێڵی جیرایلی تورکی – Geraili Turks – لە جێی خۆبان .. لە دامێنی دۆڵــی ئاتریک – Atrek –. ئەم کوردانە نیشتە جێبوون و ئێستە ئەم خێلە دەرکراوانەی کورد کۆمەڵگەیەکی تەواو و پێشکەوتوــــویان دامەزراندووە (٦٣) .

[ Curzon, Vol. 2, Page 174 ]

ــ کوردەکانی خۆراسان هەرچەندە وەک کوردەکانــی ڕۆژئاوا ئەوەندە شۆخ و شەنگ و جوانخاسیان تێدا نیــە .. بەڵام کەمێ لەوان درێژترن و زیاتر لە کوردەکانی لورستان ئەچن وەک لەوەی لە کوردەکانی ناوچەی ڕۆژئاوا بچن بە تایبەتی لە ڕووی دارشتن و باڵای بەرزیانـــــەوە و وەک لــورەکانیش موزەردیان زۆر تیە .. سەر لەخەنە گرتن لە ناو ئەم کوردانە دا باوە و .. بلوشەکانیش زۆر لە کوردەکان جیاوازن (٦٤) .

[ Ivanov, P. 152 ]

● هۆزی کەیوانلو – Kaiwanlu –

ئەم هۆزەش لە لایەن شا عەباسە وە لە ناوچەی باگــوری ڕۆژئاواوە بۆ خۆراسان دوور خراووتەوە (٦٥)

[ Curzon, 1892, Vol. 1, P.P. 97, 48 ]

## ـ جاف ـ

عەشرەتی جاف عێلێکی کوردی کۆچەرییە •• مەیدانی قەلەم ڕەوی ئەم عەشرەتە لە «کفری»و«شیروانە» تا «کەلیخان» و دەرووبەری «سنە»یە •• ژیانی ئەمانە بەپێی سەردەم ژیانی ڕەوەندی بووە و ماڵاتیان بەخێو کردووە •• کوردستان هەر چەندە خۆی لە خۆیدا وڵاتێکی بە پیت و ناوچەیەکی کشت و کاڵ بووە •• ئەمانە لە سەردەمێکی زووەوە خۆیان لە ژیانی شارستانی و دێهات نشینی دوور گرتووە •• لە لێزمەی بارانی بەهار و گۆلی گەرمیان و کوێستاند گەڕاون و ژیانیان بەسەر لەوەرگەکن کردووە و گۆشت و شیری ئەم ماڵاتەیان خواردووە و ڕۆن و کەرە و پەنیر و ماست •• هتد •• لەشیرەکە درووست کردووە و موو خوری ماڵاتەکەشیان ڕستوون و جل و بەرگ و شتی پێویستی خۆیان لێ درووست کردون ••بەم جۆرە بەناو بەهار و گۆلی گەرمیان و کوێستاند گەڕوان و ژیانیان بەسەر بردووە •

جاف ـ عەشرەتێکی کوردە • بە نیشتەجێ و کۆچەری و بەگزادە و بۆرە پیاوە وە ئەمڕۆ (٣٠) هەزار خێزان ئەبن و سەرچاوەی بەگزادەکانیشیان ئەچێتەوە سەر ـ یار احمد بەگی

کوڕی سیف‌الله بەگی کوڕی احمد بەگی جوانڕۆ ــ ئەم ــ یاراحمد بەگە ــ دوو کوڕی بووە ــ تاهیر بەگ و زاهیر بەگ ــ زاهیر بەگ بەخۆی و دەستو پێوەندیەوە سەردەمی سولتان مــرادی چوارەم سالی ــ١٦٢٣ ــ١٦٤٠ ــ لە زەهاو چۆتە پاڵ سولتان مراد و «دزیایی» کردوو بە هوار و هەر لەوێشدا مردووە ..

سولتان مراد ئەم دەستەیەی لە بەر شەڕ و شۆڕی نێوان عوسمانی و ئێرانی یەکاندا بۆ کەلک لێ وەرگرتن ئەگرێتەخۆی و هەر بەو ناویشەوە واتە «جافی مرادی» ناونران و بەرەکەی تریشــیان کە پێیان ئەڵێن «جافی جــوانڕۆ» هــەر لــە ئێران ئەمێننەوە .

(+) ئەم زانیاریە م لە کتێبە بەنرخەکەی خوالیخۆشــبو مامۆستا (علاءالدین سجادی)م وەرگرتووە کە لە ژێر ناونیشانی (مێژووی ئەدەبی کوردی) بە خوێنەری کوردی بەرێز پێشکەش کراوە (لاپەرەکان ٤٦٩،٤٧٠،٤٧١،٤٧٢) چاپی یەکەم بەغــــداد ١٩٥٢ .

## ـ سور میری ـ

هۆزێکی کوردە و لە خانەقین و دێهاتە کانی دەوروپشتی جێ گیربوون و بەم جۆرەی خوارەوە بوون :

| تیرەکان | سەرۆکەکانیان |
| --- | --- |
| ١ ـ قەیتول | قەنە حاجی |
| ٢ ـ تونـك | خلیل ئاینە |
| ٣ ـ کلاوایی | کوێخا خەتول |
| ٤ ـ مامەجان | تاماز |
| ٥ ـ خێ وەلیان | علی جان باوە جان |

گەورەی ئەم خێڵە واتە «سورمیری» حسین بەگ بـووە دوای ئەو بابا بەگ کراوە بەسەرخێڵ و دوای ئەو حاتم بەگ بووە بەسەرۆکیان ، کە حاتم بـەك مرد ،، محمـود بەگیان هەڵبژارد بۆ سەرۆکایەتی ئەم سەرۆکایەتیەی دوای مردنی بۆ حسین بەگی کوری مایەوە ،، حسـین بەگیش لەسـالی ١٩٢٦ هاتۆتە دنیاوە و ئێستە لە شاری بەغدا نیشتەجێیە ،

شوێنی ئەم هۆزە ،، قەزای خانەقینە ،، بەتایبـەتی عەلیاوا و حاجی قەرە و قەلای ودك  خێڵەکەش خۆی پـەیوەندیەکی

باشی لەگەڵ خێڵە کوردەکانی تردا بەتایبەتی ـ باجەلان و دەلۆ و تاڵەبانی ـدا و ئەو هۆزانەدا هەیە کە لە دەوروبەری قـەزای خانەقیندا جێ گیربوون •

(+) ئەم زانیاریەم لە کاك (حـسـین محمـود بـەگ) سەرخێڵی ( هۆزی سورەمیری ) خۆی وەرگرتووە کە سـالی (١٩٢٦) لە شاری خانەقین هاتۆتە دنیاوە وئێستاکە لە گـەرکی ( الثورە ) لە شاری بەغدا دادەنیشی •

Notes on Kurdish Tribes on and beyond the borders of Mosul Vilayat and westward to the Euphrates. [ By. F. J. R. ] July - 1919.

## ( بەشی دووەم )

( هۆزەکانی بەرزاییەکانی ڕوباری دیجلە )

خێلی ئەبو تاهیر

هۆزێکی بچووکە •• لە ناوچەی خوارووی ـخەربووتـ نیشتەجێیە •• ئەڵێن گوایە ئەمانە بەنەژاد عەرەبن • (؟) •

ـ خێلی عالیان ـ ئالیان « Alian »

ســەر خێلەکانیان

١ـ «شێخ محمد»ی ماران : بیست دێی هەیـە لــە دەشتەکانی ئەم ناوچەیە پەرشی و بلاون •

٢ ـ اسـماعیل حافظی برهات : خاوەنی چـل دی یـەلە دەوروبـــەری گردەکانـی ژووروی ڕیگەی جـــەزیرە ـ نصیبین ـ کە (٣٠) میل لە قەزای «نصیبین» ەوە دوورە •

شوێن :باکوری ڕێگەی جزیرە ـ نصیبین ـ

(×) ئەم بەشە دەقی وەرگێراوی کتیبە کەی [ E. J. R. ] •

هێز :«١٠٠» خێزان و «٥٠» ئەسب و «٣٠٠» تفەنگ

خاسیەتە گشتی‌یەکانیان :

ئەمانە پشتە جێن وکاتی خۆی باجیان بە شێخانی « شمر » ئـــدا .

● علی دینلی (Ali Dinlı)

هۆزێکە سەر بە یەکێتی هۆزانی بەرزایە .

● علیخا « Alika »

تیرەیەکە لە کۆمەڵی هوێرکی .

● ئەلیکان « Aliqan »

سەرخێل .. حاجی ئۆمەر

شوێن .. سعێرت

هێز ..«٢٠٠» خێزان

ئەم هۆزە سەر بە یەکێتی هۆزەکانی میرانە .

● ئەرابیە « Arabia »

تیرەیەکە لە کۆمەڵی هوێرکی .

● ئارناس « Arnas »

تیرەیەکە لە کۆمەڵی داکشوری .

● ئاتوشی « Atushi »

سەرخێل :ـ اسماعیل ئاغا .

شوێن :ـ خواروی هێلی گویان تا ئەگاتە گەلی سندیو لە وێشەوە بۆ قوشاب .

● ئەزناکور « Aznaqur »

سەرخێڵ :ـ احمد یوسف •
ژمارەی دێکان :ـ «٣٠» دێ •
ژمارەی خێزان «٢٠٠٠» خێزان
ژمارەی ئەسب «٥٠» ئەسب •

شوێن :ـ قەزای «نصیبین» بە تایبەتی رۆژهەڵاتی باکوری ئەم قەزایــــە •

نیشانە هەرە دیارەکان :ـ خێڵێکی هێمن و زۆرە •
کاتی خۆی باجیان بە شێخانی « شمر » داوە •

● بدر علی « Badarali »
سەرخێڵ :ـ بەکر بەگ •
شوێن :ـ بیست میلێك دووری ناوچەی باکوری ئورفە نیشتەجێن •
هێز :ـ «٢٥٠» تفەنگ •

● بەرین «جومانی» (Barin)
سەرخێڵ :ـ اسماعیل کوڕی داود
شوێن :ـ زۆخ
هێز :ـ «٧٠٠» تفەنگ

● بار گوهان « Barguhan »
خێڵێکە سەر بە یەکێتی خێلی میللیەکانە •

● باراهان « Barahan »
هۆزێکی بچووکە لە «یامەد» لە ناوچەی دیاربەکر جێ گیرە•

● بەروار « Barwar »

سەرخێڵ : نەناسراوە ••

هەرچەندە «رشیدبەگ» کە لە تیرەی بالآیە و لە رووی جێگە و رێگەو دەو لەمەندی و هێز و هەلکەوتوویەتی ناسراوە بەلآم ئەم خێڵە سەرۆکێکی بەرز و زۆر ناسراوی نیە •

● تیرەکان :ــ ژێری و بالآ

سەرۆکەکانی ژێری :ــ محمد صالح ئاغا •• محمد ئاغا ••

طاهر ئاغا •• محمد و طاهر کوڕی

«حسن ئاغا»ن کە ئێستە مردووە •

هێز :ــ «٤٠٠» تفەنگ

سەرۆکی بالآ :ــ طاهر بەگ :ــ نەیارە بەرامبەر رشید بەگ و موسی بەگ •

هێز :ــ «٧٠٠» تفەنگ

شوێن :ــ تیرەی ژێری لەو دۆلەی کە ئەکەوێتە

خوارووی «گارەداغ»ە ەوە •• لە باشوری

ناوچەی «ئامێدی» جێ گیرن •

تیرەی «بالآ»ش لەو دۆلەدا کە ئەکەوێتە نێوان «سەرئامێدی» و «یشیلیداغ» نیشتەجێن •

نیشانەی تەوا و دیاریان :ــ

لەم دوو تیرەیەدا ،تیرەی «بالا» زیاتر ئەریتی تایبەتی عەشرەتەکەی پاراستوە ..بەلام لە رووی شارستانیتی یەوە کەمێ دواکەوتووە ..ئەشتوانین بلێین ئەوەکانی هێمن و لەسەرخۆن ..بێجگە لەمانەش جوتیاری باش و چالاکن .. جەنگەکانی جیهان زیانی گەورەیان لێداون و عوسمانی یەکانیش بێ بەزەیی ونامەردانە تێیان کەوتوون و باج و سەرانەیان لێ (سەندوون) و سوخرەیان پێکردوون .. بە تایبەتی تیرەی «ژێری» ئەو ستامکاریانەی زۆر چەژت .

«پیاوەکانی ئەم خێلە ..کە ناودارین» :ـ

رشید بەگ ..پیاوی ناودار و ناسراوی ئەم هۆزەیە .. عوسمانی یەکان کاتی خۆی باپیرە گەورەی ئەم پیاوەیان کە ناوی «موسا بەگ»بوو ..کە پشتا و پشت سەر خێلی ئەم هۆزەیان کردووە .. لە سەر خێلی لابرد بەم لابردنەی «موسا بەگ» ..

ناکۆکی یەکی گەورە کەوتۆتە نێوان «رشید بەگ و موسا بەگ»ەوە .. بەلام ئەوەی کە لێرەدا مەبەست بێ ئەوەیە کە «رشید بەگ مرۆڤێکی زۆر هێمن و لەسەر خۆودانایە و بۆ چارە سەرکردنی گیر و گرفت هەمیشە باوەڕی وایە کە بە ئاسایش کارەکە بیڕێنێتەوە و دوور بێ لە دەستدانە چەک .. پیاوانی ناودارانی تری ئەم خێلە .. وەک عثمان بەگ وجمیل

بەگ و نسیم بەگ •• بودلەن و لای خێلەکەیان ئەوەندە بایەخدار نین ••هۆزی «ژێری» یش لە عثمان ئاغا بەولاوە کە لە هەموویان دنیادیدەتر و داناترە کەسێکی وا بایەخداریان تێدانیە •• چونکە محمد صالح ئاغایان نەک هەر بێ دەسەڵاتە بگرە زۆریش بەدناوە •• «محمد ئاغا»ش هێشتا هەرزەکارە و تاقیکردنەوەی کەمە و«طاهر ئاغا»ی برای خەریکی چەتەیی‌یە وریۆ گری‌یە••ماوەیەک لەمەوبەر گیرا و رەوانەی بەندیخانەی موسڵ کرا • شوباتی سالی ١٩١٩ توانی خۆی دەرباز بکات •• لەو کاتەوە تا ئەمڕۆ لە و چیایانە وەکو «یاخی» یەک‌ئەژی •

● بیرازی « Bernzieh »

خێڵێکە ••یاخود کۆمەڵێکە ــ لەوە نزیکترە کە یەکێتی‌ــ ــیەکی هۆزانە بێ نەک خێڵێک ••ئەم هۆزانە هەر لە کۆنەوە لە هەرێمی «سیروج» نیشتە جێن و یەکێتـــی‌یەکەیان لـــەم هۆزانەی خوارە و پێکهاتووە :ــ

| هۆزەکان | پێش جەنگ ••مژارەی خێزانەکانیان |
|---|---|
| ١ ــ کیتکان | ٧٠٠ خێزان |
| ٢ ــ شێخان | ٦٠٠ = |
| ٣ ــ ئۆکیان | ٧٠٠ = |
| ٤ ــ شەدادان | ٧٠٠ = |

٥ ــ علی‌دنلی ۷۰۰ =

٦ ــ معافــان ۷۰۰ =

۷ ــ زروان ۵۰۰ =

۸ ــ پیچان ۸۰۰ =

۹ ــ دینــان ۱۰۰۰ =

۱۰ــ قەراج ۵۰۰ =

۱۱ــ میر ۱۰۰۰ =

۱۲ــ دیدان ۳۰۰ =

سەرۆکەکان :ــ

۱ ــ شیخ تۆل سەرۆکی هۆزی شێخانە

۲ ــ محمد کوڕی عەبدی سەرۆکی هۆزی پیجانە

داب و نەریتی ئەم هۆزانە :ــ

ئەم هۆزانە لە بنەڕەتدا کــــوردی ناوچەی «وان»ن •• لەسەردەمی گرانی‌یەکی کوشندەدا بۆ ئەم دەڤــرە کۆچیــــان کردووە هەندێکیان بوونەتە عەرەب و ئێستە جل و بــــەرگی عەرەب لەبەر ئەکەن و بە عەرەبیش ئەدوێن ••بەشێکیان نیچە گۆچەرین و ئەوانی‌تریان کۆچەرن •• ئەڵێن ئەمانە گوایە جەردەو ڕێگری زۆر ئەکەن لەگەڵ ئەوەشدا •• وەک کەسانی زیرەک و کارامە و پیشەزان ناوبانگیان هەیە •

● بەشیری «بشیری» « Bisheri »

سەرۆک :ــ ئیبن محمود علی

شوێن :ـ بشـیری
هێز :ـ «٢٠٠» تفەنگ

● ـ بوجاق « Bojak »

هۆزێکی ناوچیایە و لە ناوچەی سیڤریک جێ‌گیربـووە •ئەڵێن ئەم هێزە یەکێتی‌یەکی لەگەڵ هۆزانی قەرەچ و هۆش •• بە سەرۆکایەتی قەساب شێخۆ پێکهێناوە •

● ـ هایکسێن « Haikessen »

هێزێکی بچووکە و نیشتەجێی نزیک ناوچەی سیڤریکە •

● باتــوان « Batwan »

شوین :ـ دایە « Dieh »
ژمارەی خێزان :ـ «٢٠٠» خێزان
ئەم هۆزە سەربە یەکێتی هۆزانی میرانە •

● بیراڤی « Beravi »
تیرەیەکە لە کۆمەڵەی هویرکی

● چیمیکان « Chemikan »
ئەم خێڵە سەر بە یەکێتی هۆزانی میللی‌یە •

● چیارەش «Chiaresh»
ئەم خێڵە سەر بە یەکێتی هۆزانی میللی‌یە •

● کیـکی « Kiki »
سەرۆک ••عبدالرحمن

شوین :ـ هاوینان ••دەوروبەری روباری جاغ جاغـــە زستانان ••قەرەج داغ •

ژمارەی خێزان :ـ «١٢٠٠» خێزان

خێڵێکی نیمچە کۆچەریە ••ئەڵێن گوایە بە رەچەڵەک ئەچنەوە سەر شازادەیەک کە کاتی خۆی خەلیفەکانی عباسی بۆ بەڕێوەبردنی ناوچەکە ناردوویانەتە ئەم شوێنە ••سەرۆکەکانیان زۆر لە خۆیان بایین و خۆیان بە نەوەی ئەو شـــازادە ئێردەراوە دائەنێن و بە چاوێکی سووک تەماشای خێڵەکانی تر ئەکەن •

سەرۆکی ئەم خێڵە «عبدالرحمن»ە کە پیاوێکی خوێندەوارو دنیادیدە یە و شارەزاییەکی باشیشی لە کێشەکانی مێژوودا هەیە •

● چومار « Chomar »

سەرۆک ••خلیل ئاغا

شوێن •• ناحیەی «هەباک» کە ئەکەوێتە

باکوری رۆژهەڵاتی قەزای «نصیبین»ەوە

«بڕوانە خێڵی سارهان»

● داخوری « Dakhori »

سەرۆک •• فرحان ئاغا و شکری ئاغا

شوێن ئەو شوێنەی کە ئەم هۆزەی تێدا جێ گیرە هـــەر بیست میلێک سەرووی رۆژهەڵاتی قەزای «نصیبین» کەوتووە وماوەیەک باجیان بە «علی عبدالرزاق» ی گەورەی عەشـــرەتی « شـــمر » ئـــەدا •

«فرحان ئاغا»ش کە یەکێکە لە سەرۆکەکانی ئـەم خێڵە کابرایەکی گێژ و ویژو بەخێندەوار و تەوەزەلە و ئەڵێن ئەم هۆزە لە «شیرناخ»ەوە هاتوونەتە ئەم شوێنە •

● کۆمەڵەی داکشوری « Dakshorigrup »

سـەرۆک :ـ عزالدین قصر :ـ بە یەکێ لە سـەرۆکە باش ناسراوەکانی ئەم کۆمەڵەدائەنرێ و سەرۆکایەتی ئەم تیرانەی خوارەوەشی پێ سپێردراوە •

١ ـ قەراجواز ـ ٢ ڕامان ـ ٣ هەباسبانی ـ

ئەم سەرۆکە کە «عز الدین قصر»ە ئەتوانێ «١٠٠٠» چەکدار بۆ شەڕ بەرێ بکات •• لەمانەش «٨٠٠» چەکداریان بـە چـەکی سووک و بچووکەوە ئەتوانن بەشداری جەنگەکە بکەن •

| تیرەکان | ژمارەی خێزان | ژمارەی گوند | سەرۆکەکان |
|---|---|---|---|
| ١ ـ ئارناس | ٥٠٠ | ٥ | محمد صالح |
| ٢ ـ قەرجواز | ١٢٠٠ | ١١ | ابراهیم ئاغا |
| ٣ ـ ڕامان | ٦٠٠ | ٨ | محمد ئاغا |
| ٤ ـ حسن کەیف | ٨٠٠ | ٣ | حبیبی سعدالله |
| ٥ـ سحەسار | ٧٥٠ | ١٥ | اسماعیل |
| ٦ ـ کۆلیکە | ٣٠٠ | ١٥ | صالح ئیبـین ساروخا |
| ٧ ـ هاسبانی | ٤٠٠ | ١٢ | عزالـدین محمـد صالح ئاغا |
| ٨ ـ شامیخە | ٦٠٠ | ٧ | عزالدین رشید |

شـوێن :ـ ناوچـەی سـەرووی قـەزای میدیات

چاکترین نیشانەی دیاریان :

سەرۆکی بالای ئەم کۆمەلە ــ عزالدین قصر ــ

سەرۆکێکی لێهاتو و گرنگە .. لەگەل «علی پۆتی» سەرۆکی خێلی «هویرکی» کەمێ ناکۆکە و بەوە هەرگیز قایل نابێ لەگەل ئەو هۆزانەدا پەیمانی هاوزایەتی یەکبوون ببەستێ کە سەر بە «عبی پۆتی»ن .. وادیارە کە ئەم «عزالدین»ە چەند کەسێکی کوشتبێ ..سالێ رابوردوو «سالی ۱۹۱۸ ــ وەرگێر» لەم ناوچەیەدا شورشێکی گەورە دژی عوسمانییەکان بەپابوو .. عوسمانییەکانیش درندانە هێرشیان بردە سەر قەلا محکەمەکەیان و داگیریان کرد .

ئێستە عزالدین یەکی کەوتووە .. پیری و نەخۆشی کۆلەیان کوتاوە پاش ئەوەی جەنگ تواو بوو واتە ــ جەنگی جیهانی یەکەم (وەرگێر) کەمێ بەلای ئێمەدا دایئەتاشی ــ واتە بەلای ئینگلیزەکاندا ( وەرگێر) لەم دواییەدا گەلێ شتمان دەربارەی ئەم کابرایە زانی لەوانەش ئەوە بوو کە ئەم پیاوە وەك جاران لەناو خەلكدا رێزو قەدری نەماوە و زۆربەی خێلانی دەورو بەری لە دەست ناپیاوی ئەم کابرایە سکالایانە و بێجگە لەوەی کە کاری هۆزەکەی خۆی گرتۆتە دەست ، کاروباری خێلی دێرفیریش واتە بەشی تیرەی ژیری بەرێوە ئەبات و سەرباری ئەمانەش هەلوێستی رامیاری زۆر ڕوون نیە بەلام ئەوەی کە چاوەڕێ ئەکرێ ئەوەیە کە ئەو ساردیەی نێوان ئەمو علی بوتی دا هەیەتی بەم زوانە نامێنێ .

# داكشوری تامینی

« Dakshori Tamini »

سەرخێل :ــ احمد میهی ــ ئەڵێن ئەم كابرایـە لـەگەڵ ئینگلیزدا زۆر نەرمە •

| ژمارەی گوند | ژمارەی خێزان | ژمارەی ئەسب | ژمارەی تفەنگ |
| --- | --- | --- | --- |
| ٦ | ٣٠٠ | ٢٠ | ٢٠٠ |

شوێن :ــ لە سەرووی «نصیبین» بە درێژایی دۆڵی گارگارە نیشتەجێیە و پیاوانە دام و دەزگاكانی هێڵی ئاسنینی ئەڵەمانیان •• ئەوەی لە «نصیبین»ەوە تێدە پەڕێ •• پاراست و یەكێ لە خاڵە رووناكەكانی ئەم خێڵە ئەوەكە پیاوانە لەگەڵ هاووڵاتیانی فەلەدا ئەجوولێتنەوە و هەمیشە پەیوەندی دۆستایەتیان لەگەڵیاندا پتەو بووە بەڵام لەگەڵ هۆزەكانی «علی پۆتی»دا ناكۆكە •

● داشـــی – Dashi – تیرەیەكە لەتیرەكانی هۆزی میللی•

● داسیكان – Dasikan –

هۆزێكی كوردی تێكەڵاوە •• هەندێكیان فەلەن و ئەوالی تریان یەزیدین •

شوێن :ــ تور عابدین

هێز :ــ ٩٠٠ خێزان •

● دیدیرا - Dodera -

سەرۆک ــ محمود کوڕی موسلی

شوێن ــ (هێرولی)

ئەم هۆزە سەر بە یەکێتی خێڵەکانی میرانە ــ

● دێرێ ڤێری - Dereveri -

ئەم هۆزە سەرۆکێکی ناسراوی‌وای نیە کە شایەنی ناوهێنان بــێ •

شوێن :ــ قەزای سوور

| تیرە | خێزان | ژمارەی گوند | سەرۆکەکانیان |
|---|---|---|---|
| ١ ــ باندا ژوور | ٢٥٠ | ٥ | عبدالحکیم بەگ |
| ٢ ــ باندازیری | ٢٥٠ | ٥ | گوکری کوڕی عیساو توفق حەمە |

ئاکۆکی‌یەکی بێ وچان لەناو ئەم دوو تیرەیەدا هەیە •• لەو ئەجی‌جەنگی جیهــانی کارێکی زۆری نەکردێتە سەریانو سەر بەهیچ لایەک نین و کەسیش دەسەڵاتی بەسەریاندا نیە و ئەتوانن بە جووتە «١٥٠» تفەنگی نوێ و«٥٠٠» تفەنگی کۆن ئامادە بکەن بەڵام ئەوەی کە دیــــارە تیایانــــدا ئەوەیە کە دزیان زۆرە و تیرەی ــ ژیری ــ یش لەم دواییەدا لەگەڵ ــ

عزالدين قصر ـ ی سەر خێلی کۆمەلی داکشوری ـدا پەیمانی بەستووە •

● دێر مامۆکە - Dermamuka -

تیرەیەکە لە کۆمەڵەی هویرکی

● دێر شیر | Dersheir |

سەرۆك ـ عمر کوڕی عمار

شوێن ـ دێر شیر

هێز ـ ٦٠٠ خێزان

● دیـدان - Didan -

ئەم خێلە سەر بە یەکێتی خێلەکانی بەرازیە •

● دینان - Dinan -

خێلێکە سەر بە یەکێتی خێلەکانی بەرازیە

● دورکان - Dorkan -

شوێن : ـ دامێنی چیای تور عابدین

هێز :ـ ١٢٠ خێزان ـ هەندێکیان بەزیدین

● دودی کانلی - Dudikanli -

تیرەیەکە لە خێلی میللی •

● دومانـا - Dumana -

تیرەیەکە لە کۆمەڵەی هوێرکی

● علیا - Ella -

خێلێکە سەر بە یەکێتی خێلەکانی میللیە

● دەنـان [ Danan ]

تیرەیەکە لە تیرەکانی هۆزی میللی

● ئەلکاوات - Elkawat -

تیرەیەکە لە خێلی میللی

● فەوقانی - Fouquani -

تیرەیەکە لە خێلی ئومریان

● گەڕوسی - Garusi -

سەرۆك :ــ عمر کوڕی شاهیر

شوێن :ــ گایەر ســەر

هێز :ــ ٣٠ خێزان

ئەم خێلە سەر بە یەکیتی خێلەکانی میرانە •

● گۆیــان - Goyan -

ئەم خێلە سەرۆکێکی جێگە و ڕێگەدار و ناسراوی نیە••بەلام «عوسمان بەگ» ناوێکیان هەیە•• وەك دەرئەکەوێ لەنــاو ئەم هێزەدا لە هەموویان گرنگتر و بەدەسەلاتتر ە ــ ئــەم خێلە ملهوڕ و سەرکێشە و هەموو دەم کانگای ئاژاوە و شەڕ نانەوە بووە بۆ میرەکانی عوسمانی و ئینگلیزەکان ••خێڵێکـــە هەمیشە لە شوێنە سەخت و دژوارەکانداژیاوە •

هێز ــ ٤٠٠ تفەنگ

شوێن ــ خێڵێکی دڕە و لەسەر سنور بیست میلێك دووری باکوری زاخۆ دائەنیشن و بەلام بەزۆری لە دەوروبەری ویلایەتی موسل جێ‌گیرن •• سەردەمی ئامادەکردنی ئەم ڕاپۆرتە «سالی ١٩١٩ــ وەرگێڕ» پەیوەندی نێوان ئەم خێلە و خێلی «سیندی»

و «سنبقانی» درواسیی باش نه‌بوو •• له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا که‌وته به‌ر به‌ره‌کانی‌کردنی‌فه‌له‌کان و ئه‌م به‌ربه‌ره‌کانی کردنه‌ش بووبه هۆی ئه‌وه‌ی که شیرازه‌ی ئاسایشی ناوچه‌که به گشتی تیکچیّ و ئه‌م کاره‌ش له لایه‌ن «عبدالرحمن ئاغای شیرناخ»ه‌وه پشتگیری ئه‌کرا و هان ئه‌درا •• به تایبه‌تی ئه‌و شه‌ڕ و شـــۆڕه‌ی له‌م دواییـه‌دا بوون به هۆی کوشتنی «کاپتن‌بریستۆن» ئه‌فسه‌ری رامیاری و لیپراساوی ســه‌ربازی ئینگلیزه‌کان که لــه‌لایه‌ن گۆیانـــه‌وه لـه‌نـاوبرا •

● گولیکـا - Gulika -

به‌شیکه له کۆمه‌ڵه‌ی داکشوری

● گه‌ر گه‌ری - Gargari -

سه‌رۆکه‌کان ــ سلیمان ئاغا ــ ابراهیم خلیل ئاغا ــ حوسنی ئـــاغا •

شوێن ــ هه‌ر له گه‌ردی ئاوێراته‌وه تا ئه‌گاته ئاگریّ جیگه‌ی ژیانی ئه‌م خیڵه‌یه •

هیز ــ دوو سه‌د تفه‌نگ •
ژماره‌ی خیزان ــ ٥٠٠ خیزان •

ئه‌مانه به‌گشتی له ده‌وار و خیوه‌تدا ئه‌ژین و کشت و کاڵ ئه‌که‌ن و ئه‌شلیّن ــ که به ره‌گه‌ز ئه‌چنه‌وه سه‌ر عه‌ره‌ب • به‌ڵام دوانیان به کوردی کرمانجی‌یه •

● هه‌باسبانی Habasbani

تیرەیەکی خێڵی داکشورییە .

● حاجی بەیرەم – Haji Beiram –

یەکێکە لە
خێڵێکە ناسراوەکانی ناوچەی بۆتان ــ وەرگێڕ ــ
وسەربەیەکێتی خێڵەکانی میللییە

● حەسنیەکان – Hassanekan –

خێڵێکە سەر بە یەکێتی خێڵەکانی میللی .

● حوسن کەیف – Hassankaif –

تیرەیەکە لە کۆمەڵەی داکشوری

● حەسار – Hassar –

تیرەیەکە لە کۆمەڵەی داکشوری

● هوێرکی – Hawairin –

سەرۆك :ــ علی بۆتی . نەك هەر گرنگترین بگرە بەهێزترین سەرۆکی ناو ئەم خێڵەیە .

| تیرەکان | ژمارەی گوند | ژمارەی خێزان | سەرۆکەکان |
|---|---|---|---|
| ١ ــ عەلیخا | ١٥ | ٦٠٠ | ١ ــ هوتو کوڕی حسین عمر |
| | | | ٢ ــ عوسمان صالح |
| | | | ٣ ــ علی بۆتی |
| ٢ ــ سەیدا | ١٠ | ٧٢٠ | |
| ٣ ــ دیرمامۆکا | ١٥ | ٥٠٠ | خلیل زادە |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٤ ــ صالحه | ٦ | ٤٠٠ | حسن حمه صالح |
| ٥ ــ میزڕاك | ١٢ | ٥٠٠ | رەمەزان اسماعیل |
| ٦ ــ پیراقی | ١٢ | ٦٠٠ | عوسمان عەبدی |
| ٧ ــ عەربیه | ٥٠ | ٢٤٠٠ | عبدالكریم |
| ٨ ــ دومانا | ١٢ | ٧٠٠ | محمدی علیكو |
| ٩ ــ قەرەعەلیكا | ١٧ | ١٥٠٠ | یوسف سلیمان و عوسمان |

«علی پۆتی» دەسەڵاتیشی ئەگەر بە سەر ئەو خێڵانەدا نەبێ ..ئەوی راستی بێ.. لە ناو گەورە پیاوانی ئەم هۆزەدا ئەوی گرنگ و شۆرەت و ناوبانگێکی زۆری هەبێ هەر ئەوە چونکە دەستی لەناو تیرەی «عەلیخا ــ سەیدان ــ دێرماموکا،سالەیی ، میزاڕاك»دا بە باشی ئەڕوات و ئەتوانێ «٢»هەزار سوارێك بۆ جەنگ بەرێ بکات و هەزار لەمانەش بە لایەنی کەمەوە هەریەکەی لە (٢٠٠) تا (٣٠٠) فیشەکی پێیە .. بەڵام ئەوە هەیە کە ئەم یەکێتییە تا سەر نیەو لەوانەیە کە کوت وپڕ .. لە هەموو کات و سەردەمێکدا یەکێتییەکی تر سەر هەڵدات •

چونکه «علی پۆتی» هەرچەندە توانی یەک لە دوای یەک دەراوسێکانی هەموو سەر کوت بکات و بیانخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە بەڵام نەیوێراوە قەت خۆی لە هۆزی «شیرناخ» بدات و دەستەڵاتیان بە سەردا پەیداکات .. بۆیە پەیوەندی نێوان هەردوولا ئیستە باش و پتەو دامەزراوە •

سالی ١٩١٩ لەگەڵ «عبد الکریم» سەرۆکی ئەم هێزەدا تێکچوو .. شـەڕەکە هەرچەندە زۆر گـەرم نەبوو کـە لـە نێوانیانـە پەیـدا بوو ..بەڵام «علی پوتێ»تـوانی بەسـەر «عبدالکریم»دا سەرکەوێ و ئەمە سەرکەوتنەش زۆری نەخایاند چونکە «عبدالکریم» توانی هێزە تەرە بووەکانی کۆبکاتەوە و جارێکی تر شەڕ لەگەڵ «علی بۆتی» و هۆزەکەیدا بکات و دەری بخات کە ئەگەر لە «علی پوتی» بە هێزتر نەبێ لەو کەمتر نیە .

بە هەر حاڵ .. ئێسـتە «علی پۆتی» ە سـەرپەرشتکاری کاروباری خێڵی «سارهان ــ چۆمار ــ وسولکانە» وئەم خێڵانـە هەرچەندە پەیوندیان لەگەڵ خێڵی «هویرکی» «علیپوتی»دا باشە ..ئەوەی شایەنی باسە ئەوەیە کە ئەم خێڵانە لەگەڵ «علی پۆتی» جیاجیا سەودا ئەکەن .

لە حزیرانی ساڵی١٩١٩دا ئەوە بیسترا کە «عل ی پـوتی» ئەیویست دەستبەسەر مەلبەندە میرییەکانی ناوچەی میدیاتدا بگرێ و سەرنەکەوت و ئەنجـامی ئـەم کارەش لـەگەڵ لقێك سەربازی عوسمانیدا کەوتە شەڕەوە و هەردوولا هیچیان بە هیچ لـەکرد .

● هیـسولیـە – Hisulich –

ئەم خێڵە سەر بە یەکێتی خێڵانی میللیە

● هوشـن – Hoshin –

هۆزێکی چیاییە .. لە ناوچەی سیڤیرێك جێگیربـوون

ئـەڵێن لەگەڵ هۆزی «بوچـاك و قـەرەچ» دۆستن !

● ئەسیادات - Isiadat -

هۆزێکە سەر بە یەکێتی هۆزانی میللی‌یە

● جیلایان ـ [Jelayan]

سەرکردەکان :ـ رسول ئاغا ـ صادق ئاغا .

ناوچە :ـ دیـە - Dieh -

هێـز :ـ ٤٠٠ ـ تفەنگ

● ژێرکی - Jerkieh -

سەرکردەکان :ـ سامۆ کوڕی تامۆ ـ عبدالرحمن خانجی

ناوچە :ـ رۆژهەڵاتی گۆیان ـ کەناری روباری خاپور ـ لە بەیت شەباب .

هێز :ـ ٣٠٠ تفەنگ

● کالیندەلان - Calendalan -

سەرۆکەکان :ـ عبدالقادر داروغ ـ لەگەڵ اسماعیلی کوڕی ابراهیم پاشای میللی لە شوباتی ١٩١٩ ناوەکو ئێستە کە تەموزی «١٩١٩»یە لە دیاربەکرلە بەندیخانەی عوسمانی‌یەکان توندکراون ناو ئەم خێڵەدا ئەوی جێی عبدالقادری گرتۆتەوە .. «قەساب شێخۆ»یە کە دیارە و گوایە لەلایەن هۆزەکانی ناوچەکە و هۆزی «بوچاك و هۆشن»ەوە پشتگیری ئەکرێ .

ناوچە :ـ رۆژ ئاوای ( دیاربەکر) لە سەر رێگەی سیڤێرك .

هێز :ــ (٨٠٠٠) تفەنگ و هەر خێڵی «کالیندەلان» بە تەنیا «١٢٠٠» خێزانە •

مێژووی ئەم خێڵە :ــ

ئەڵێن گوایەئەم هۆزە لە بنەڕەتدا تورکمان بووە ••لەو تورکمانانــەی ناوچــەی ڕۆژئاوای «ئەنەدۆڵ» بـــەڵام وەک خۆیان ئەگێڕنەوە کاتی خۆی «سولتان سلیم» دوای ئەوەی خێڵی «زیرەکی و تریکان» و چەند خێڵێکی تری کوردی لــەم ناوچەیەدا دەربەدەرکرد و لە شوێنی باو باپیرانیان دووری خستن و لە سەر ئەورێگە نارەوا رامیاری یە بەدناوەی کە بە تورک کردنی ئەو هۆزانەی کە تورکێنیپەرش و بلاوەی پێ کردن و ئەمانی هێناوە لە جیاتــی هۆزە کــوردەکان کە رەوانــەی رۆژئاوای «ئەنەدۆڵ» کردوون لەوێــدا دایناون کە لەبنەڕەتدا لە شــوێنە بەرزەکانی «قەراچەداغ» ئەژیان و بەهاتنیان بۆ ئەم ناوچەیەی کەخاکی کوردە و پێیان ئەڵێن «قەرەجیجی» زۆر زوو لەگەڵ کورد ــکانی دەوروبەریاندا دۆستایەتی و تێکەلاویان پەیداکردووە و لە رێگەی ژن و ژن خوازی یەوە بوون بە خزم و لەودەمەوە وردە وردە بەرگی کوردیان لەبەر کردووە زمان و نەریتی تورکمانانەی خۆیان لەبیر چۆتەوە و بوونەتە کوردێکی تەواو و زمان و دووان و کردار و جل و بەرگ و ئامانج و ناونیشانی جیاواز ان لەگەڵ کوردەکاندا نیە و چەند هۆزێکی کوردی کۆچەری تریش بــە نیازی ئەوەی فەرمارەوایانی عوسمانی چاویان لێیان بێ تێکەلاویان

بوون ..چونکه ئەم «قەرەجیجانە» لەو دەمەوە کە (سـولتان سلیم) لەم شوێنەی داناون لەلایەن فەرمانڕەوایانی عوسمانی‌یەوە بۆ دڵنەوایی‌کردنیان یارمەتی زۆریان بۆ ئەهات .

«قەرەجیجەکان» هۆزێکی نیمچە کۆچەرین ــ دواکەوتوو ملهوڕ و جەربەزە و تووڕە و چەقاوەسوون و زوربەیان رێگری پیشەیانە و ئەوی راستی‌بێ ئەمانە لەکەیەکی تاریکن بە روخساری بێ گەردی کوردەوە .. ژمارەشیـان رۆژ بە روژ زیاد ئـەکات چونکە دەرگایان هەمیشە لەسەرپشتە بۆبێ‌کەڵك وراکردووە ناله بارەکانی هۆزەکانی‌تر .

● قەراجوس Karajus

تیرەیەکە سەر بە کۆمەڵی هۆزانی داکشوری‌یە .

● کێلان دڕێن Kelandrın

هۆزێکی بچووکە لە دەوروبەری گوندی گەگەری دائەنیشن کە ئەکەوێتە سەر رێگەی ( ماردین ــ نصیبین‌ـ ەوە) دێیەکە تەنیا (٢٠) میلێك لە «نصیبین»ەوە دوورە .

سەرۆکەکان :ــ احمد ئاغا و محمود ئاغا .

تێبینی :ــ هۆزێکی تریش هەیە بە هەمان ناوە ..

لەوە ئەچێ کە هەردووکیان لە بنەڕەتدا یەکێ بن بەڵام هۆزی دووەم ئێستە سەربە یەکێتی هۆزانی بەرازی‌یە

● کیلیش Kelish

تیرەیەکە لە هۆزی میللی

● کیرکا Kerka

ناوچە :ــ قەزای جزیرە

هێز :ــ ١٠٠٠ خێزان

ئەم هۆزە سەر بە یەکێتی هۆزانی میرانە •

● کیاتکان Keyatkan

هۆزێکی سەر بە یەکێتی بەرازی‌یە •

●خالیجان

بەشێکە لە یەکێتی هۆزانی میللی •

● خالکا •• حالکیە Khalkeih

سەرۆکەکان :ــ غربی ئاغا و حاجی کوڕی حسن •

ناوچە :ــ هاوینان سەرووی شیرناخ •• زستانان ناوەراستی ڕێگەی زاخۆ و جزیرە •

هێز :ــ ١٠٠ تفەنگ •

● خالە جاری Khalajari

هۆزێکە سەر بە یەکێتی هۆزانی میللی یە •

● کیجان Khaljari

سەرۆک :ــ یوسف ئاغای رەش‌سپی

هێز :ــ ٢٠٠ تفەنگ •

ناوچە :ــ کەناری دەستەراستی روباری دیجلە نزیکەی دورگەی دیۆتان و جزیرە ە

ئەم هۆزە سەر بە یەکێتی هێزانی میللی‌یە •

● کیکی Kiki
بروانه تێبینی‌یه که‌مان که له سه‌ر خێڵی «چیچیه» •

● کێران (Kiran)
تیره‌یه‌که له هۆزی میران •

● کۆهسار - Kohsar -

سه‌رۆك :ــ ئه‌م خێڵه سه‌رۆکێکی ناسراوی نی‌یه و له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌دا •• خێزانی «ئێل به‌گله‌ر» کاروباری ئه‌م خێڵه ئه‌گێڕی که خه‌لکی قه‌زای «سوورن» و کوێخای دێگانی ئه‌و قه‌زایه‌ن، ژماره‌ی گونده‌کان :ــ (۱۰)

ژماره‌ی تفه‌نك :ــ ٥٠ تفه‌نگی نوێ و (۲۰۰) تفه‌نگی جۆراو جۆر ناوچه :ــ قه‌زای «سوور» •

ئه‌م خێڵه دزو و جه‌رده‌ی زۆره و به‌ئاسانی ده‌ستیان به‌سه‌ردا ناگیرێ •• سالآنی جه‌نگ سه‌دی ده‌ی ئه‌ندامانی ئه‌م خێڵه لــه ناوچــوون •

● کۆم نارش - Kumnaresh -
تیره‌یه‌که له یه‌کێتی هۆزانی میللی

● معافان - Ma'afan -
هۆزێکه سه‌ر به یه‌کێتی هۆزانی به‌رازی‌یه •

● ماهی‌للامی - Mahalami
سه‌رۆکه‌کانی ئه‌م خێڵه له «کافرهه‌وا» دانیشن •
ناوچه :ــ قه‌زای میدیات

| ژمارەی دێ | ژمارەی خێزان | سەرۆکەکان |
| --- | --- | --- |
| ٢٠ | ٢٥٠٠ | خلیل بەگ |
| | | حسن بەگ |

خاسیەتی گشتی :ــ مامی ئەم سەرۆکانەی سەرەوە کە «خلف بەگ»ە لەم دوایەدا عوسمانییەکان گرتیان ولە سێدارەیاندا .. کەچی لەگەڵ ئەوشدا ئەم دوو سەر خێلە لەگەڵ عوسمانییەکاندا ناکۆك نین و ئەڵێن بەلامانەوە هیچ گرنگ نیە لە سێبەری میری عوسمانی یاخود سیبەرێکی میرییەکی شریفەدا بژین چونکە هەردوو لایان موسولمانن .

ئەم هۆزە لەبەر تێکەڵاوی بێ رادەیان لەگەڵ هۆزەکانی دەوروبەریاندا گەلێ لە داب و نەریت و کردوەی کوردیان لە یادکردووە و لە عەرەبەکان نزیك‌بوونەتەوە و هەرئەمەشە وای لێ‌کردوون کە زمانی عەرەبی بزانن و رێك و پێك پێی بدوێن .

باری ئابوری ئەم خێلە پاش جەنگی یەکەمی جیهان باشترە لە دۆخی پێش جەنگیان و سەرۆکەکانیشیان هەر بە ناو سەرۆکن چونکە دەسەڵاتیان بەسەر ئەوانەی لە دێکانی خۆیان دوورن زۆر کەمە و خۆشیان لە ناو خێلەکانی تردا لە بەردڕندەیی رەوشت و ستەمکاری و دڵرەقیان بەدناون و دوورەپەرێزیشن و لە خەڵکی بە گومانن .

میژووی ئەم خێڵە :ـ ئەوەی لەناو ئەم خێڵەدا باوە ئەوەیە کە گوایە ئەمانە ئەچنەوە سەر فەڵە بوون • «٣٥٠» ساڵ بەر لە ئامادەکردنی ئـەم ڕاپۆرتەی کە سـاڵی (١٩١٩) نووسـراوە کارەساتێك ڕوویداوە و وای لێکردوون کـەواز لە ئاینی فـەلە بهێنن •• ئەڵێن گرانی یەك بووە کە گەنم و دەغل و دان نەبووە •• ئەمانیش چوونەتە لای «پاتریارك» کەیان و داوایان لێکردووە فتویان بۆ بدات «بە ڕێکەوت جـەژنی بەرۆژوبوونیان بـووە» کەڕێگەی گۆشـــت خواردنیان لـەو ڕۆژەدا لێ نەگیرێ •• «پاتریەرك»یش یەکسەر ئەمەی پێ وتوون :ـ لە پیناوی تێربوونی سکی ئێوەدا چۆن من پێ بە یاسا ئاینیەکانماندا ئەنێم ؟بڕۆنو چاورێ سـەرپێچیوا لە من مەکەن •

کەئەمەیان لە «پاتریارك» بیست لەو جەژنەدا گورج کەوتە گۆشت خواردن •• پاشان هەر بەتەواوی وازیان لە ئاینی فەلە هێنا و بوونە موسولمان ••جگە لەزمانی زکماکـی خۆیان کـە کوردیە••بە عەرەبیەکی شگاویش ناوە ناوە ئەدوێن •ژنەکانیان هەمیشە چلو بەرگی سوور لەبەر ئەکەن وپەچە و عەبا بـەکار ئەهێنن •• لەم دوایەدا کۆمەڵێکی زۆری عەرەبی دەور پشێد پێ گەیشت •• بەشێك لەم هۆزە ئەڵێن گوایە ئەمانە بە رەسەن ئەچنەوە سەر هۆزی «بنی هلال» کە هۆزێکی عەرەبە و چەند سەد سـاڵێك لەمەوبەر لە دورگەی عەرەبەوە هاتوونەتە ئـەم شوێنە واتە دەشتەکانی سەرووی قەزای «نصیبین» •• بـەلام

وەك بۆمان روونە ئەم جۆرە وتانە پێویستی بـەلگە ئەكـەن كە ئەمانە نیانە ..بەلام ئـەوە هەیە كە لەمـەوبەر گرانـی‌یەك روویداوە و حەوت سالێ درێژەی كێشاوە و ئەم گرانی‌یە ئـەم خێڵەی كردووە بە دوو كەرتەوە ..بەشێكیان چوونەتە «تونس» و بەشـەكەی تریان «مەحللامی» یە لەم شوێنەی ئێستەیان كـە سەرووی «نصیبین»ە جێ گیر بووە .

● ماتمیـە – Matamieh –

هۆزێكە سەر بە یەكێتی هۆزانی میللی‌یە .

● مینـدان – Mindan –

تیرەیەكە لە خێڵی میللی

● یەكێتی هۆزانی میللی .

مێژووی ئەم خێلە :ــ سەرچاوە جۆراوجـۆرەكانی ئـەم خێلە میللەتی كورد ئەكەن بەسێ كەرتی سەرەكی‌یەوە

١ ــ میللی ٢ ــ زیلان ٣ ــ باباكوردی .

هەر لە دێر زەمانەوە وەك میللی‌یەكان خۆیان ئەلێن لەگەل یەكدا ناكۆك بوون و هەمیشە خەریكی شەڕ و شۆبوون .

سەرەتای سەدەی نۆزدە ..سەردەمی سولتان «محمود» سێ شازادەی مەزن دەسەلاتیان بەسەر خوارووی رۆژ هەلاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا بووە كە ئەمانەی لای خوارەوەن :ــ

١ ــ ایوب بەگ‌ی باپیرە گەورەی هۆزی میللی كە هەموو ناوچەی «جزیرە»ی بەدەستەوە بوو .

٢ ــ پاشا كۆرەی ڕەواندز كە فەرمانڕەوایی نــاوچەی سۆرانی بەدەستبووە •

٣ ــ شیخ صفوگ ــ ســەرۆكی بــەدووە عەرەبەكانی خوارووی ناوچەكە بووە •

ئەم سێ شازادەیە برایەتیان پڕی خۆشەویســتی و كامەرانــی و حەسانەوە بووە و سەربەست بوون و خۆیان بەهیچ لایەكەوە نە بەستبۆوە وبایەخیشیان ئەوەندە بە فەرمانڕەوایی ئەستەنبۆڵ و والییەكانی بەغدا نەئەدا ••بەلاّم جار جارێ لە ناو خۆیانــدا تیكنەچوون و شەڕیان لەگەڵ یەكتر ئەكرد ••ئەنجام سولتانی عوسمانی بڕیاری لە ناوبردنی دان و هات بەسەركردایەتی رشید پاشا بۆ سەركوتكردنیان سوپایەكی گەورەی ناردە سەریان •• پاش شــەڕێكی خۆینــاوی ســـوپاكەی رشـــید پاشـــا توانــی ڕەوانـــدز بگــری وپەشـــای كۆرە دەســت بەســەر بكات و پاشــــان لە ناوی ببات •• هەر لـــەو كاتـــەدا بەشێكی تری ئەم ســـوپایە توانی «ابوب بەگ» و «شیخ صفوگ» بگری و هێزەكانیان تــەفر و تونا بكات و هەردوو شازادەیان بە بەندی ڕەوانەی بەندیخانەكانی دیار بەكر كرد و و لەوێ بەدیلی تامردن مانەوە •• دوای هەموو ئەم نگرە وبەردەیە عوسمانییەكان بەســەر هەموو ناوچــەی كوردستاندا زاڵبوون و ئەوی كەمێ سەری بەرزبكرادیە تەوە دژیان بەو پەڕی دڵ ڕەقییەوە لێی ئەدرا •• بەلاّم ئەم بــارە

بەهۆی بەرپاوونی شەڕی نێوان مصر وعوسمانی‌یەکان زۆری نەخایاند .. چونکە «تیماوی بەگ»کە کورەزا و جێگری «محمود پاشا»ی میللی بوو سەرۆکایەتی ئەو خێلە گەورەیەی ئەکرد ..ئەم شەڕەی بەهەل زانی و ویستی پاشقولێ لە عوسمانی‌یەکان بگرێ .. ئەوە بوو وای بەباش زانی کە دژی عوسمانی‌یەکان پشتی مصری‌یەکان بگرێ .. ئەوە بوو هات «ماردین»ی داگیر کرد ..بەلاّم ئەم بارە درێژەی زۆر نەکێشا چونکە بەهۆی بەرپابوونی چەند گیر گرفتێکی ناوخۆوە «تیماوی بەگ» کوژرا .

سولّتانی عوسمانی دوای ئەوەی کە سەر لە نوێ بتوانێ دەست‌بەسەر ئەو ناوچەیەدا بگرێ هات بە تەواوی هێزی میللی ئابلوقەدا و باری ئابووری تەواو پەرپووت کردن .. ئەم بارە نالەبارەش درێژەی کێشا تا «محمود بەگ»ی کوری «تیماوی بەگ» پێ‌گەیشت و دەستی بە سەرئیش و کاری هۆزەکەیدا گرت .. ئەم بەگزادە لاوە پاش ماوەیەکی کەم توانی کۆرانکاری‌یەکی زۆر بهێنێتەکایەوە ـ بەتایبەتی دوای ئەو یارمەتی‌یەی کە لە پاشای «دمشق»ەوە چنگی کەوت و ئیتر رێگەی بۆ تەخت‌بوو کە بەرەنگاری هێرشە ناپەسندەکانی هۆزەکانی «طی»و «شمر» رابووستێ و نەیەلێ بیژنەوە و ئیتر بۆی گونجا کە ئەندامانی هۆزە پەرش وبلاّو بووەکەی لە شاری «ڤیران شار» کۆبکاتەوە .. بەم جۆرە توانایەکی گەورەی پەیداکرد و وهۆزەکەی ئەوتۆ

بـەکیان گرتبـوو هەرمەندەلە دروسـت کردنی « ڤـیران»دا تووشــی هەنــدێ تەنــگ و چــەلەمــە هات •• بەڵام هۆزەکەی لە ناوچەکەدا بووە هێزێکی کاریگەر و بە دەسەڵات •

ئەم دەسەڵات پەیداکردن و پەرە سەندنەی بە دڵی «عمـر پشای ــ والی دیار بکر» نەبوو •• بۆیە خۆی پێ ڕانەگـیرا هات سوپایەکی گەورەی ڕێخسـت و بەرەو و «ڤیران شار» بەرێ کەوت •• مەبەستی سەرەکی ئەو هێرشەشی سەرکوتکردنی هێزە باشەکەی «محمود پاشا»ی «میللی» بووە •• جالەبەر ئەوەی کە سووپاکەی «عمر پاشا» زۆر دڕندە و بێ بەزەیی بوو «محمود پاشا» هەمیشە داوای بەرەڵاکردنی باوکی ئەکرد •• نـاچـار گاربەدەستانی عوسمانی «محمود پاشا»یان بەرەڵاکرد و پـاش چـەندمانگێ لـە بەربوونی « محمود پاشا » مرد وئەمەشـی ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو جەزرەبەدان و ئەشکنجەیەی کە لە بەندیخانەدا بەدەست عوسمانیەکانەوە توشیهات •• پاش مردنی «محمود پاشـا» «ابراهیم پاشا»ی کوڕیجێگەی گرتەوە و بووە سەرۆکی هۆزانی میللی •• بەڵام «ئیبراهیم پاشا» لە بەر ئەوەی لاوێکی خوێن گەرم بووهەموو دەم لە کاروانی میری عوسمانی ئەدا ئەمەش وایلێکردن بیگرن و لە خاکی باو و باپیرانی دووریبخەنەوە•هەر چۆن بوو ئەم دوورکەوتنەوەیە زۆری نەخایاند چونکە توانی خۆی دەرباز بکات و بە قاچاغی بچێتەوە ناوچەکەی خـۆی و

ماوەیەک بەم شێوەیە بە قاچاقی مایەوە و دوای رێکەوتننامەی ئاسایش بەرپابوونی لەگەڵ کاربەدەستانی عوسمانییەکاندا مۆرکرد گەچی کە شەڕی نێوان روس وعوسمانییەکان دوایی هات ۰ سەر لە نوێ «ابراهیم پاشا» کەوتەوە هێز پیشاندان و خــۆ دەرەخستن ۰۰ سەرەڕای ئەمانەش چەنــد دەستێکیشـــــی لەعوسمانییەکان راوەشاند ۰۰ وردە وردە بێدەنگ خێڵەکەی کۆکردەوە ورێکیخستن وتوانیدڵی شێخ وسەرخێڵەکانی دراوسێ نەرم بکات و بۆ لای خۆی رایان بکێشێ و بیانکاتە دۆستـی خۆی و بەرە بەرە وای لێهات کە خێڵی میللی بکاتە بەهێزترین خێڵی کـــورد وە ئەمــەش ئەگەڕێتەوە بۆ وریایی و زرەنگی و وەهەڵکەوتوویی خۆی ۰

ئەم سەرخێڵە دوای گەشتەکەی ئەستەموڵی لەگەڵ چەنــد سەر خێڵێکی تری کورد توانی لە هێزەکانی «حمید»ی خۆی ناونووس بکات ۰۰ سوڵتان «عبدالحمید»یش هات وپلەی ژەنراڵی پێ بەخشی و خەڵاتی پاشایشتی دایە ۰ «ابراهیم پاشا» ئـەم هەلەی لە دەست نەدا و رامیاریانە ئەجووڵایەوە و لەم ڕێگەیەوە توانی کرداری نالەباری هۆزەکانی «عزە»و«شمر» بووەستێنێ و کۆتای بەو کۆمەڵە چەکدارانە بهێنێ کە دەستە وبەجیا خەریکی ڕێگری ڕووتکردنەوەی ئەم و ئەو بوون ۰

ئەم سەر خێڵە کوردە کە یەکێك بوو لە ســـــەرۆکەکان گرۆدانی «حمید»ی کەچی لە نەریتە رەسەنەکانی نەتەوەی کورد

•• وەك پاراستنی ژیان و ماڵ و موڵكی فەلەكان لای ئەدابوو •• ئەم خاڵەش یەكێك بوو لە خاڵە رووناكەكانی ئەم سەر خێڵە كوردە و بەم هۆیەوە توانی سەدان خێزانی فەلە لە شـــــاری «ڤیران شار» كە پایتەختی «میللی»یەكان بوو كۆبكاتەوە و وەك مەڵبەندێكی بازرگانی گرنگیش بازاڕێكی زۆر دەوڵەمەنـــد و گەشاوە و پەرەسەندووی پێكهێنبا •

سەرچاوە باوەڕ پێكراوەكان ئەڵێن «ابراهیم پاشا» توانیوێتی كە بە تەنیا «١٠» هەزار ئەرمەنی پێش هەڵگیرسانی جەنگـــی یەكەمی جیهان وەك سـەرۆكێكی دووربین لە كوشتن و بڕین رزگاربكات و هەمیشە بە شوێن ئەوەشدا ئەگەڕا كە رێكەوتننامەی برایانە لەگەڵ عەرەبەكاندا وەك «جانیش عقدلی» و «نكباری» و «شواهین» مۆر بكـات بـەلام خێلی «طـی» و «جبور» و «شمر ـ عنزه» دوژمنی بوون و هەر خەریكی ئاژاوە نانەوەبوون بەلام ئەم سەرخێڵە كوردە توانی بەهێزترین پەیمانی دۆستانەی لەگەڵ خێلی «چیچی» ببەستێ كە خێلێكی كوردی ناسراوو بە توانـا ـ بوو و كارێ بكات كە نەیەڵی دوژمنەكانی بتوانن كار بكەنە سەری و تەگەرە بخەنە رێگەی و •• دوای چەند مانگێ بەهۆی لێهاتووی و بەهێزی و دیبلۆماسی‌یەتی خۆیەوە توانی كە بناغەیەكی پتەو ی‌پەیوەندی یەكی برایانە لەگەڵ تیرەیەكی بەهێز و گرنگی خێلی «شمر»دا دابڕێژی كە «شیخ جارالله» سـەرۆكی‌بوو •• سالی ١٩٠٤ «ابراهیم پاشا» لەگەڵ خێلی قەرەجدا تێكچـو ،

عوسمانی‌یەکانیش ئەمەیان بەهەل زانی و خۆیان هاویشتە ناو شەڕەکەوە و ئەفسەرێ لە هێزی عوسمانی‌یەکان بریندارکرا و هێزەکەش لە لایەن هێزەکەی «ابراهیم پاشا»وە چەککرا • ئەم شەڕە زۆر کاری کردە سەر «ابراهیم پاشا»وە وای‌کرد کە خۆدی فەرمانڕەوایی بە هۆی ئەوەوە کە دەسەڵاتی جارانی بەسەر خێڵەکاندانەبوو بەرەو ئاوابوون بچێ ••بەڵام ئەوە بوو کە کۆڵی‌نەدا و پاش ماوەیەکی کورت توانی خۆی کۆبکاتەوە و بگرە لە جاران زۆر بەهێزتر مەیدان بگرێتەوە و تاجەنگی یەکەمی جیهن هەڵگرسا هەر بەو هێز و دلێری‌یە بمێنێتەوە •

یەکێتی هۆزانی «میللی» بریتی بوو لە ٤٨ خێڵی کە لە رووی هێز و ژمارەوە جیاوازبون زوربەی ئەم خێڵانە لەو سێ‌گۆشەیەی «نصیبین و ئۆرفە و دیار بکر» دا رەشمالیان هەڵدابوو کۆچەری‌بوون •• تەنانەت چەند خێڵێکی دوور وەکو خێڵەکانی «دەرسیم» کە لە بازنەی فەرمانڕەوایی «ابراهیم پاشا»دا بوون کەوتەبونە ناو رکێفی یەکێتی هۆزانی میللی بەناوبانگەوە

شوێن :ــ پایتەختی ئەم خێڵە «قیران شار»ە •

سەرۆکی ئێستەیان :ــ محمود بەگی کوڕی ابراهیم پاشایە• عوسمانی‌یەکان تەقەللای زۆریاندا کەئەم «محمود بەگ»ە بخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە بەڵام ئەمەیان بۆ نەلوا و نەیانتوانی دەستەمۆی بکەن و تا وەکو ئێستەش «١٩١٩ ــ وەرگێڕ» هەڵوێستی بەرامبەر بەعوسمانی‌یەکان دڵ رەقانەیە •• کەچی

کوردەکان لە هەڵوێستی رامیارانەی ئەم «محمود بەگ»ە زۆر دڵسارد و خۆشی لەوە ناچێت کە حاوەنی بیر و باوەڕێکی پتەو بێ بەڵام هەرچەندە ئینگلیزەکان بە تەواوی بۆ دۆستایەتی پشتی پێ نابەستن لەوانەیە بەوە قایل ببێ کە پارێزگاری ئینگلیزەکان بکات •

ئەم «محمود بەگ» سێ برای هەیە ــ خلیل ــ اسماعیل ــ عبدالرحمن •

| هۆزەکان | ژمارەیان | شوێن | خاسیەتە گشتییەکان |
|---|---|---|---|
| ١ ــ دنن | ٢٥٠ | رۆژهەڵاتی ڤیران شار | کۆچەرین |
| ٢ ــ سیدان | ٤٥٠ | سەرووی دەنان | = |
| ٣ ــ کیران | ٥٥٠ | سەرووی رۆژهەڵاتی سیدان | = |
| ٤ ــ دوکانلی | | نزیك قارتو | = |
| ٥ ــ خالاجان | ٧٠٠ | خواروی رۆژئاوای دیار بکر | = |
| ٦ ــ کیلیش | | سەرووی دیار بکر | = |
| ٧ ــ میندان | | قەراچە داغ | = |
| ٨ کۆمنارش | ٢٥٠ | خواروی رۆژهەڵاتی دیار بکر | = |
| ٩ ــ شیریکیان | ٨٠ | رۆژهەڵاتی ڤیران شار | = |
| ١٠ ئەلکوات | | رۆژهەڵاتی کۆماریشە | = |

١١ــ داش سەرووی ماردین =

١٢ــ کالیندالان دەرسیم و خوارووی ماردین =

١٣ــ حاجی بیرام خوارووی رۆژئاوای جزیرە =

١٤ــ حسنیکان ٢٦٠ لە نزیك نصیبین -

١٥ــ خلە جاری ٧٠٠ خوارووی رۆژهەلاتی حسن خان =

١٦ــ ئیلایا

١٧ــ ئسایەدات ٨٥ سەرووی رۆژهەلاتی ڤیران شـــاد =

١٨ــ تیرکان ٧٠٠ خوارووی ئیسایەدات =

١٩ــ ناسریان ٧٥ لە نزیك راس العین =

٢٠ــ پتهوڤان ٢١٠ سەرووی ڤیران شار =

٢١ــ سارتان ٨٠ راس العین =

٢٢ــ ئەو شاخان ٧٠ =

٢٣ــ مانیە ٨٠٠ سەرووی راس العین =

٢٤ــ چیمکان ٢٥٠ سەرووی رۆژئاوای چیمکان =

٢٥ــ بارگۆهان ١٣٠ سەرووی بارگۆهان =

٢٦ــ هیسولیە ٥٠٠ سەرووی رۆژئاوای هیسولیە =

٢٧ــ چیا رەش گەراج داغ نیمچە =

٢٨ــ زیروفکان ٢٠٠٠ رۆژئاوای سیڤریك نیمچە =

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٢٩ـ داغ باشی | ژمارەیەگی گەورە | | |
| ٣٠ـ هوشیان | — | رۆژئاوای سیڤریک نیمچە | = |
| ٣١ـ بوجاك | | سەرووی رۆژئاوای | = |
| ٣٢ـ پیسکی | ٨٠٠ | سیڤریک نیمچە | |
| ٣٣ـ حاجی مانلی | ٥٠٠ | لە نزیك بیرەجیك | نیشتەجێن |
| ٣٤ـ جاکالی | ١٠٠٠ | سەرووی بیرەجیك | کۆچەرین |
| ٣٥ـ میردیس | ١٠٠٠ | سەرووی حاجی مانلی | = |
| ٣٦ـ کاسپانی | ٥٠٠ | رۆژئاوای جاکالی | نیشتەجێن |
| ٣٧ـ بوتیرە گیج | | سەرووی سیڤریك | = |
| ٣٨ـ جان بیگ | | سەرووی میردیس | کۆچەرین |
| ٣٩ـ بیلیان | ٥٠٠ | سەرووی بوتیرەگیج | نیشتەجێن |
| بوگرا | | نزیك خەربووت | = |
| ٤٠ـ دریجان | ٨٠ | سەرووی دیریجان | نیشتەجێ و کۆچەرین |
| ٤١ـ کاو | ٥٠٠٠٠ | دەرسیم | |
| ٤٣ـ گیڤران | ٥٠٠ | رۆژئاوای دیاربکر | |

● میر - Mir -

خێلێکە سەر بەیەکێتی عەشایەری بەرازییە .

● میران - Miran -

سەرخێل :ـ ئایف بەگ .

شوێن :ـ قەزای جزیرە .. کەناری چەپی رووباری دیجلە

خاسیەتە گشتی یەکان :ـ

ئەم خێلە کۆچەری یە •• لە هاویندا لە بەرزاییەکانی واندا خێوەت و چادری لێ هەڵئەدەن و بە هۆی جەنگەوە ئێستە ئەم گەرمیان و کوێستان کردنەیان وەستاوە و ئەوەشـی کە جێی سەرنج ڕاکێشان بێ ئەوەیە کە ئەم گەرمیان و کوێستان کردنەیان ئەبووە هۆی ئەوەی کە لەگەڵ خێڵی شیرناخدا لە سـەر ئاو و لەوەڕ شەڕ و هەرا بکەن •

● میرانی یەکان :ـ بەگشتی کەللەڕەق و ملهوڕ و سەرگەرمن «نایف بەگ»ی سەرخێلیان هەرچەندە مرۆڤێکی لێهاتو و لەسەر خۆ و دنیادیدە و بەیشووە لەگەڵ ئەوەشدا زۆر ڕاڕایە و ترسیشی لەوە زۆرە کە تووشی گیر و گرفت بێ چـونکە وەک ئەڵێن دەستێکی گەورەی بووە لە ناوچەی فیشخابوردا لە کوشتن و بڕینی فەلەکاندا و وەکو ئەیگێڕنەوە «٩٠٠» فەلەی زیاتر لەناو بردووە •

هێز :ـ (١٠٠٠) خێزان •

ئەم خێڵانەی لای خوارەوە سەر بە یەکێتی هۆزانی «میران»ن کە (نایف بەگ) سەرۆکی بالآیانە •

| هۆزەکان | ژمارەیانشوێن | سەرەکەکان |
| --- | --- | --- |
| ١ ـ والیسیری | ٣٠٠ | یوسف ئاغا |
| ٢ ـ کیمان | ٢٠٠ | قاسـم |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٣ ــ تيان | ٣٠٠ | | |
| ٤ ــ موسا ڕەشە | ١٥٠ | | |
| ٥ ــ خيركا «گيركا» | ١٠٠ | | |
| ٦ ــ گەڕوس «گاڕوس» | ٣٠ | كاديەر | عمرسو شاهر |
| ٧ ــ پينجى نانا | ١٥٠ | پينجى نانا | جميل سوشاتو |
| ٨ ــ عليخان | ٢٠٠ | ســعيرت | حاجى عمر |
| ٩ ــ ديديرا | ١٠٠ | حيرونى | محمود سو موسا |
| ١٠ــ باتوان | ٢٠٠ | ديـــه | |

● ميرسينى - Mirsini -

له رووى قەوارەوە خێڵێكى مامناوەندى‌يە و لەسەر رێى سەرەكى خواررووى ــ ماردين و ــ نصيبين‌ــ ەوە جێ‌گير بووە •

● ميزاژاك - Mizizak -

تيرەيەكە لە كۆمەڵى هوريكى

● مومان - Moman -

شوێن :ــ ناوچەى سەرووى رۆژئاواى جزيرە

هێز :ــ «٦٠٠» خێزان •• «٩٠»يان لە جەنگى يەكەمى جيهان فەلەبوون و دووانيان گرمانجى‌يە •

● موسا ڕەشە - Mosa Rasha -

هێز :ــ «١٥٠» خێزان

ناوچه :ــ قەزای جزیرە

سەر بە یەکێتی هۆزەکانی میرانە •

● نێروە ــ نێرڤە – Nerva –

سەرۆکەکان :ــ سعدۆ و کریم •• ئەمانە زیاتر کوێخایەکی ئاسایین نەک سەرخێڵ بن

شوێن :ــ نیشتەجێیەکی بچووکە و لەخوارووی چاڵ سەرووی ئامێدی •

هێز :ــ «٧٥» تفەنگ

● ئۆقیان ــ ئوکیان – Okina –

ئەم خێڵە سەر بە یەکێتی خێڵەکانی بەرازییە

● اومریان – Omarian –

لە کاتە نائاساییەکاندا ئەم خێڵە سەر بە «محمدی جزیر» یە•

ئەم تیرانەی سەرەوە بەر لە جەنگ ســــەر بە حیزانی «بەگلەر» بوون••کە سەرۆکایەتی ئەم خێڵەیان کردووە و ژمارەیان نزیکەی «٢٠» کەسێك ئەبێ •• ئەوەی کەشـــایەنی باســـی بێ ئەوەیە کە پەیوەندی یەکی واپتەوی ئەوتۆ ئەم تیرانە بەیەکەوە ئەبەستێ کە هەمووان وەك یەك خێڵ ئەجوولێنەوە و بەشێك لەمانە خەریکی جەردەیی وتالآن و بڕۆن وناوچە کەش بــەڕەزە دێم تەنراوە •

هێز :ــ چوار سەد تفەنگی نوێی بچووك و سووکەڵەیە کە هەموو تفەنگێ «٣٠٠» فیشەکی لەگەڵدایە و «١٥٠٠» تفەنگی کۆنیشیان هەیە •

بەڕێوەبردنی ئیش و کاری ئەم هۆزە زۆر ستەمە بۆیە هەمیشە لە هەرا و ئاژاوە نانەوەدان •
شوێن :ـ قەزای «سوور» •

● پێنجی نانا - Penji Nana -
سەرۆك :ـ جمیل کوڕی چەتۆ
هێز : «٦٥٠» خێزان
ئەم خێلە سەربەیەکێتی هۆزانی میرانە •

● پیجان Pijan
خێلێکە سەر بە یەکێتی خێلانی بەرزاییە

● پینار علی - Penar Ali -
خێلێکی بچووکە و قەزای «سادە»ی کردۆتە مەلبەند و ئەم قەزایەش حەوت میلێك لە «نصیبین»ەوە دوورە و کەوتۆتە سەر ڕێگەی ماردین •

●ریکان - Raikan -
سەرخێل :ـ حاجی ئاغا
شوێن :ـ ڕۆژ هەلاتی زێی گەورە کە سەرووی زێبار و بروزهی و ڕۆژئاوای ئۆرمان لە ناوچەی ئامێدی ئەگرێتەوە •
هێز :ـ «٢٥٠» تفەنگ

دەسەلاتی «حاجی ئاغا» هەرچەندە بە تەواوی بە سەر هەموو خێلەکەدا ناڕوات •• ئەتوانین بلێین لە ئاغاکانی تریان دەست ڕۆیشتووترە • هەر لە کۆنەوە جۆرە ناکۆکی‌یەك لەنێوان ئەم

خێڵە و ئۆرماردا هەیە •• ئۆرمایش کە «سیتو» سەرۆکینـە لەمان بەهێزترن و تەنانەت ــ ڕێکیانیەبە کانیشی بەدەست تالان و برنی ئۆرماریەکانــەوە بەتایبەتی ســالانی جەنگ کەوتبونــە زەلالەتەوە •

زانیاریەکی ئەوتۆمان دەربارەی مێژووی ئەم خێڵەکوردە نیــــە •

● رامان – Raman –

تیرەیەکە لە خێلی داکشوری

● صالحە – Saliha –

تیرەیەکە لە خێلی هوێرکی

● سارهان (Sarhan)

سەرۆك :ــ علی بۆتی

ئەم خێڵە سەر بە یەکێتی خێڵەکانی «علی بوتی»یە کە لەخێلی «سولکاری»و هوێرکی و چۆمار پێکهاتووە •

هێز :ــ هێزی ئەم یەکێتیە بەم جۆرەی خوارەوەیە •

| ژمارەی دێکان | ژمارەی خێزان | ژمارەی ئەسپ |
| --- | --- | --- |
| ٣٠ | ١٥٠ | ٤٠ |

ژمارەی تفەنگی نوێ :ــ «٥٠٠» تفەنگ •

ئەم سەر ژمێرە ئەو ژمارانەن کە بە ئاسانی و سروشــتی ئەتوانین دەستمان بکەوێ و ئەتوانین ٤٠٪ بخەینە سەر ئــەم ئەم ژمارانە •

جا ئەگەر یەکێکی وەك «علی بۆتی» کە نمونەی گەورەی جەتەگەری وچەقاوەسووی‌یە سەرۆکی ئەم یەکێتی‌یە بێ ئەوەدیارە کە یەکێتی‌یەکەش دز و درۆزن وجەردەن •

(ئەمە ڕای ئینگلیزە داگیر کەرەکان بووە ئەوسەردەمە ـ وەرگێر)

شوێن :ـ گردەکانی سەرووی رۆژهەلاتی «نصیبین» و ناحیەی «هاباك»ە ••پروانە هۆزی هوێرکی •

● ســــارتان - Saran -

ئەم خێلە سەر یەکێتی هۆزانی میللی‌یە

● ســیدان - Seidan -

تیرەیەکی خێلی میللی‌یە

● سەراکیجی پروانە خێلی سورکیجی

● ســـیدا [Seida]

تیرەیەکە لە هۆزی هوێرکی

● شەدادان - Soikan -

ئەم عەشرەتە سەر بە یەکێتی هۆزانی بەرازیە

● شێخان -Shaikhan -

سەرۆك :ـ حاجی احمدی ئەڤینە •

هێز :ـ «۷۰۰» خێزان •• ئەم خێزانانە لە «۹» دێـدا جێ‌گیربوون و ••سەردەمی جەنگ زەرەر و زیانێکی زۆریان پێ نەگەیشت •

شوێن :ــ قەزای «سوور»

خاسیەتە گشتی‌یەکان :ــ بە شیوەیەکی گشتی زۆر هێمن و بێ دەنگن .. بێجگە لەوەی کە «حاجی احمدی ئەفینە»ی سەر خێلیان کار و باریان بەرێك و پێکی بەرێوە ئەبات هیچ جۆرە گیر وگرفتێکیش دۆخی ئاسایی تاکو ئێستە تێکنەداون .

عەشرەتێکی تریش بەهەمان ناو هەیە و لەوانەیە کە بە بنەچە بچینەوە سەر ئەم عەشرەتە .. بەڵام ئەوە هەیە کە ئێستە بۆتە تیرەیەك لە هۆزی بیرازی‌یە .

● ســـــندی - Sindi -

هێزێکی تێکەڵە .. موسولمان ونەستوورین ونەستووری‌یەکان زۆر کەمن

شوێن :ــ خوارووی سەر رێگەی سەرەکـــــی رگۆیان ــ «جزیره» .

| تیرەکان | ژمارەی خێزان |
|---|---|
| سلوپی | ٦٠٠ |
| گوللـــی | ٥٠ |

بێجگە لەو خێزانانەی سەرەوە «٥٠٠» خێزانی کەش هەن کە سەر بەم دوو تیرەیەی سەرەوە نین .

ئەم هۆزە پاش لەناوچوونی کابتن پیرسون بۆ لێدانی هۆزی «گویان» ئامادەبوونی خۆی بۆ کاربە دەستی ئینگلیزەکان دەرخست و بەجوتەش لەگەڵ هۆزی «سیلڤانی»دا ئەتوانن چەند هەزار سوارێك بنێرنە مەیدانی جەنگ •

● سیلڤانی – Slivani –

ئەم هۆزە دەراوسێی «گۆیان»ەکان و پەیوندیشیان لەگەڵ یەکدا باش نیە •• جـا هەر وەك لێی دواین کە ئەمان و سندی‌یەکان ئەتوانن چەند هەزار جەنگاوەرێ بۆ جەنگ ئامادە بکەن ••دوای کوشتنی «کابتن پیرسون» سەرەکی «سیلڤانی» ئامادەبوونی خۆی دەرخست بۆ ئینگلیزەکان کە لە «گۆیان»ەکان بـدات •

● سور گیجی

سەرخێڵ :ـ حاجی احمدی ئەڤینەیە • •باوکی کامل بەگ•

حاجی احمد هەرچەندە پیاوێکی پیری بە ساڵا چووە بەڵام بەیەکی لە کوردە زۆر شارەزا و وریا و بلیمەتەکانی ئەم گەلـە دائەنرێ کە کار و باری هۆزەکەی بگێرێ •• ئەم سـەرخێڵە لێهاتووە میوان پەرژەو ئەتوانین بیکەینە دۆستی خۆمان و •• ئەتوانینن زیاتر بەلای خۆمانا ڕایکێشین • ئەم کابرایە زۆر دەو- ـڵەمەندو بەهێزە •

| تیرەکان | ژمارەی دێکان | ژمارەی خێزان |
|---|---|---|
| ١ ــ چەمی ژوور | ١٠ | ٦٠٠ |
| ٢ ــ چەمی ژێر | ٢٣ | ١٣٠٠ |

٤٠٪ کەسانی ئەم هۆزە لە سالآنی جەنگی یەکەمی جیهاندا تیاچوون • هۆزی «شێخان»یش هەر لە ژێر دەسەلآتی «حاجی احمد»دایە وئەتوانێ «١٢٠٠» تفەنگ و «٤٨٠٠٠٠» فیشەکیان بۆ جەنگ پێ ئامادە بکات •

شوێن :ــ قەزای «سوور»

«حاجی احمد» لەگەڵ کاربەدەستانی عوسمانی گەلێ نەرم بوو و هەموو کاتێ یارمەتی داون و لە لاوانی خێلەکەی سەربازی باشی بۆ گرد کردوونەتەوە •• ئەم پیاوەنە هەر دووربین و دنیادیدەیە بگرە هەمیشە خەریکی لێکدانەوەی ئەوەیە کە چۆن بۆی بلوێ خۆی وهۆزەکەی لە دەستدرێژی و ستەمکاری عوسمانیەکان دوور بخاتەوە •

«کامل»ی کوڕیشی مرۆڤێکی رۆشنبیر و ئاسۆ فراوانە و دەرچووی زانکۆیەکی «سویسرا»یە •• هەر کە گەڕایەوە ولآتەکەی چووە ریزی سووپای عوسمانیەکانەوە •• دوایی کراوە بە ئەفسەری پەیوەندیکردنی نێوان لیژنەی بەرزی ئەرکانی جەنگی شەڕی یەکەمی جیهان و سەرکردایەتی سووپای عوسمانی •• ئەم کابرایە کورد پەروەرە و لەو بڕوایەدایە کە

هاوکاریکردن لەگەڵ هێزە تازەکاندا بۆ دابین کردنی مافـــە ڕەواکانی گەلی کورد ئەرکێکی پێویستە .. واش چاوەڕوان ئەگرێ کە ئەم «کامل بەگ»ە بەم زنیکانە وەك رامیاری واێکی دەرکەوتو و ناسراو ناوبانگی هەموو کوردستان بگرێتەوە .

سەرخێلی ئەم هۆزە دەسەڵاتێکی پۆلاینی بەسەر تیرەکانی خێڵەکەیدا هەیە و رێز و پایەشی لەناویاندا هەیە و هۆزەکەش خۆی لەگەڵ هۆزەکانی تردا ڕێکە .

● تاهتـــانی – Tahtani –

تیرەیەکە لە هۆزی ئومریان .

●تامینی – Tamini –

لەگەڵ عەشرەتی داکشوری .. زۆر تێکەڵاون .

● چوڤان – Chuvan –

هۆزێکە سەر بەیەکێتی هۆزانی میللیە .

● تیرەکان – Terkan –

هۆزێکە لە یەکێتی هۆزانی میللی

● تیان [ Tiyan ]

هێز :ــ «٣٠٠» خێزان

شوێن :ــ ناوچەی جزیرە

ئەڵێن ئەمانە بە رەسەن ئەچنەوە سەر هۆزی«طی»ی عەرەب ..ناویان لە ناو هەموو هۆزەکاندا زۆر بەدناوە .

● اوسباخان - Usbakhan -

عەشرەتێکە لە یەکێتی هوزانی میللی

● والی سیری - Waleseri -

سەرخێڵ :- یوسف رزاق

هێز :- «٣٠٠» خێزان

شوێن :- قەزای جزیرە •• سەر بەیەکێتی هۆزانی میللیە•

● زیروان - Zerwan -

عەشرەتێکە سەربە یەکێتی هوزانی میللیە

● زیروفکان - Zirofkan -

خێڵێکە سەر بەیەکێتی هۆزانی میللیە

# جەلالی [ Jalali ]

هوزێکی کوردی شاخاوی ملّموڕ جەربەزەیە [1] .
مەلبەندی بنەرەتی ئەم هۆزە سێ گۆشەیە سنورییەکەی نێوان ئێران تورکیا و روسیایە .

شوێن :ـ ئاگری داغی گەورە (تورکیا) ، ئاگری داغ بچووك (ئێران) هەندیکیشیان لە دەور و بەری شارەزووردا (عیراق) نیشتەجێن سەروکەکان :ـ حەلیم شای جەلالی کە لە دوا سالأنی سەدەی شازدەهەم و سەرەتای سەدەی هەڤدەهمدا .. شۆڕشی کوردی (ئەرارات)ی گێرا دژی رژێمی عوسمانییەکان [2] .

شایەنی باسیش ئەوەیە کە ئەو شۆڕشە بۆ ماوەی (٥٥) ساڵبەردەوام‌بوو و لە نێوانیدا .. کوردەکانی ئەو ناوچەیە زەرەر و زیانێکی زۆریان بە هێزەکانی دوژمەن گەیاند . لە پاشا عوسمانییەکان توانیان ئەو شوڕشە کپ کەنەوە و ئەو خێڵە کوردە تەروەنەبکەن [3] .

## تیرەکانی خێلی جەلالی

١ ــ هەلیکان
٢ ــ تەمنکان
٣ ــ تەمو خۆران
٤ ــ هەسا سۆران
٥ ــ لقزل باش ئۆغلیان
٦ ــ کەچەلانی
٧ ــ گۆران
٨ ــ بودیکانی
٩ ــ ڕەشکی
١٠ ــ چومکان
١١ ــ بەرهیکانی
١٢ ــ ســـــاکات
١٣ ــ میرســـــکانی
١٤ــ بلێخکی (بلیخکانلو)
١٥ ــ مسرکانلو
١٦ ــ جولکانلی

۱۷ ـ باتوك

۱۸ ـ پژدەری

۱۹ ـ شیخ سمایلی

۲۰ ـ لەك احمد لەوەند

۲۱ ـ هورمزیار

۲۲ ـ سـایتاری

۲۳ ـ دكارانـی

۲٤ ـ كافروشی

۲٥ ـ مامە لەیسی

۲٦ ـ هەیاسی

۲۷ ـ اسمایل عوزەیری

۲۸ ـ مەرزەنك و گرزەیی

۲۹ ـ گەشكی

۳۰ ـ كورد

۳۱ ـ علی محۆی

۳۲ ـ دۆتكی

۳۳ ـ امەمكانی

۳٤ ـ كولین

۳٥ ـ ئۆمۆیی

